MÛSA ANTER

# برینا رەش

موسا عەنتەر

منتدى إقرأ الثقافي www.iqra.ahlamontada.com

BIRÎNA REŞ

محەمەد لوزوون و
ژان دۆست
پێشەکییان بۆ نووسیوە

لە کورمانجییەوە:
محەمەد عزەدین




**دەزگای فام**

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

**بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری**

**Birîna Reş**

Musa Anter

Publisher Aram

ISBN: 978-9944222549





**چاپی یەکەم - ٢٠٢٣**


# برینا ڕەش

نووسینی

**مووسا عەنتەر**

لە کورمانجییەوە

**محەمەد عزەدین**


بابەت: **شانۆگەری**

پێداچوونەوە: لوقمان باپیر

**پێوانە**

١٣.٥*٢١سم (١٤٢) لاپەڕە

ISBN: 978-9922-9876-5-1

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٧٤)ی ساڵی٢٠٢٣ی پێ دراوە.

# برینا ڕەش

مووسا عەنتەر

لە کورمانجییەوە:

**محەمەد عزەدین**

**ژان دۆست** پێشەکیی بۆ دەقە سۆرانییەکە و

**محەمەد ئوزوون** پێشەکیی بۆ کورمانجییەکەی نووسیوە.

"مووسا کوڕی خۆم، گەلێک بەوەی خەمبار بووم کە منداڵمان نابێ، بەڵام تۆ و عەبدولڕەحمان قاسملوو ئەو بۆشاییەتان بۆ پڕ کردمەوە. ئێستا زۆر بەختەوەرم، گەر بشمرم بە ئارامی چاوان لێك دەنێم".

**کامەران بەدرخان**

"ئەم کتێبە پێشکێش بە سەید سافییەی دایکم دەکەم، چونکە بە نەخۆشکەوتنی ئەو، برینێکی ڕەش لە جەستەی من دروست بوو".

**محەمەد عزەدین**

## ناوەڕۆك

## مووسا عەنتەر و برینا ڕەش

شانۆنامەی (برینا ڕەش)ی مووسا عەنتەر، لە ساڵی ١٩٦٥ بڵاو کرایەوە.

ئاپێ مووسا خۆی لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی: "ئەو کتێبەم ساڵی ١٩٥٩، ئەو کاتەی لە زیندانی تاکەکەسیی ژمارە ٣٨ی گرتووخانەی حەربییە، لە ئیستانبوڵ دەستگیر کرابووم، نووسی".

مادەم وایە، با بگەڕێینەوە بۆ ساڵانی پێش نووسینی ئەو کتێبە. لەوێ دەمێدا، سەرجەم شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی کورد لە ساڵانی (١٩٢٥-١٩٢٨-١٩٣٠-١٩٣٦-١٩٣٨-١٩٤١-١٩٤٢...) سەرکوت کرابوون. کورد بەرەورووی دەسەڵاتێکی داپڵۆسێنەری هەمەگیر ببوونەوە. لەسەر خاکی کوردان، دووکەڵی ئاگرێکی بە تینی بەردەوام بەری ئاسمانی گرتبوو. ترس و بێباوەڕی و نیگەرانی، لە هەموو شوێنێك، باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشابوو. بە سەدان و هەزاران ڕووناکبیر و کەسایەتیی دیاری کورد کوژران و لەنێو بردران و وڵاتبەدەر کران. زمانی کوردی و هەر شتێکی دیکەی پەیوەندیی بە زمانی کوردییەوە هەبووایە، قەدەغە کرابوو. کوردی قەلەندەر، خنکاوی دەریای پرسە و شینوشەپۆڕێکی بێ بن بوو. وێرانبوونی نیشتمان و ئەو بارودۆخەی تێی کەوتبوو، کوردی بێچارەی خستبووە دەریای هەژاری و مەرگ و ئەسرین.

لە سەروبەندێکی وەهادا، گوتنی "من کوردم" هەر خۆی لە

خۆیدا مەردایەتییەکی زۆر گەورە بوو. مووسا عەنتەریش لەژێر ئەو سیاسەتە داپڵۆسێنەرە قورس و دۆخە گرانانە، شانۆنامەکەی خۆی بە کوردی نووسی. نەخاسمە ئەو کارەیشی لە زیندانێکی سەربازیدا کرد.

دەقە ئەدەبییەکان، لە ڕووی مانا و گرنگییەوە، پەیوەندییەکی تایبەت و بەهێزیان بە سەردەمەکانی خۆیانەوە هەیە. سەردەمی وەها بووە، نووسینی ڕستەیەك، یان نووسینەوەی چەند وشەیەك وەك شۆڕشێك وابووە. بۆیە وەها کارێك بە شەڕەفێکی گەورە دانـدراوە. لە کاتێکـدا سـەردەمی وەهـاش هەبـووە، نووسـینی چەندان بەرگی کتێبیش هیچ گرنگییان نەبووە. بۆیە ئەوەی (برینا ڕەش)ی مووسا عەنتەری کردۆتە دەقێکی زۆر گرنگ و نەمری کردووە، تایبەتمەندییەکانی سەردەمی نووسینی ئەو شانۆنامەیەیە. لە سـەردەمێکدا کەس نەیـدەوێرا بڵـێ کـوردم و نەدەتوانـدرا ڕسـتەیەکیش بە کـوردی بنووسـرێ، مووسـا عەنـتەر لەنـاو زیندانێکی سەربازی لە ئیسـتانبوڵ، شـانۆنامەیەکی کـوردیی زۆر مانادار و جوان دەنووسێ.

گەر بە هەڵەدا نەچووبم، (برینـا ڕەش) لە دوای دامەزرانـدنی کۆماری تورکیا لـە سـاڵی ١٩٢٣وە، جـگە لەو شـیعر و داسـتانە پارچەپـارچە و پەرشـوبڵاوانەی لەولا و لەمـلا بـڵاو دەبـوونەوە، یەکەم کتێبـی کـوردیە چـاپ و بـڵاو کـرابێتەوە. وەلـێ (برینـا ڕەش) وەکوو کتێب، یەکەم کتێبە کە بە کوردی نووسرا و بڵاو کـرایەوە. بە هـۆی ئەو تایبەتمەندییەشـییەوە، ئەم دەقە، لەنـاو مێژووی ئەدەبیاتی کوردی خاوەن پێگەیەکی گرنگە.

لە کولتوور و فەرهەنـگ و تەجـرەبەی نەتەوە پێشـکەوتوو و

ڕۆشنبیرەکانی دیکەی دنیاڕا، دەزانین مرۆڤی ڕووناکبیر ئەو کەسەیە، هەنگاوی نوێ داوێ و ڕێگا ڕۆشن دەکاتەوە و دەبێتە ڕێپیشاندەری گەلەکەی. جا کە ڕێگایەکی تازەش دەکاتەوە، زانیاری و زانستی لەسەر ئەوە زۆرە، تا چۆن بتوانین بەو ڕێگایەدا گوزەر بکەین. وەلێ بێ هیچ گومانێك، لە هەمووی بایەخدارتر، کردنەوەی ڕێگایەکی تازەی دەرچوونە بۆ گەلەکەی.

سەرباری ئەو هەموو تەوژمە نەریتی و زەحمەتییانەی هەبوون، وەبەرهێنانی دەقی باڵا پێویستییەکی ناچاری بوو. مووسا عەنتەر و (برینا ڕەش) وەك نموونەیەك بەقەد ئەوەی دەقێکی پێویستی ناچارین، ئەوەندەش خاوەن کەرامەت و باڵابەرزین.

مووسا عەنتەر، لە پێشەکیی دەقەکەیدا دەڵێ: "برینی ڕەش لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات[1] زۆرن. هەر لە باپشکێو و وەرەم و گولی-یەوە بگرە، تا چەندان نەخۆشیی دیکە؛ لە هەمووشی گرانتر و هەشبەسەرتر، نەزانی و فەقیرییە". جا ئەو شانۆگەرییەی مووسا عەنتەر بۆ ئەو برینە ڕەشانە، وەك دەرمانێکە. جەهالەت و هەژاری، بۆ هەموو گەل و نیشتمانێك، برینێکی ڕەشی سەختە. جا ئەو برینەش، هۆکارێکە بۆ ئەو گەلە تا بەردەوام هێسکی بشکێندرێ و وەك دیل مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و ڕێ لە پێشکەوتنی بگیرێت. دەرمان و چارەسەری هەژاری و جەهالەتیش، شارستانییەت و پەروەردە و خوێندنەوە و نووسین و ڕووناکبیرە ڕێگا ڕۆشنکەرەوەکانین. عەنتەریش بە پشتبەستن بەو

[1] مەبەستی ناوچە کوردییەکانی ناو تورکیایە. (وەرگێڕ).

بنەمـایە، بنـاغەی سـەرەکیی شـانۆنامەکەی لەسـەر خوێنـدەواری دارِشتووە. وەك چۆن بە زمـانێکی رِەوانـی کـوردییش، بـاس لە نەداری و جەهالەتی کۆمەڵگای کوردی دەکا. گوندی زۆراڤا و ژیانی زینۆ و برۆ و پەیوەندییە خێزانییەکانی کۆمەڵگای کوردی بێچارە، نموونەکانی نـاو شـانۆنامەکەینە. لە لایەکـی دیکەشـەوە، بەدۆی کـورِی زینـۆ و بـرۆ، نمـوونەی ئەو رِوونـاکبیرەیە کە نووسەر ئامانجییەتی بیکاتە. کارەکتەری سەرەکیی شـانۆنامەکەی. بەدۆی خـاوەن کـارەکتەری سـەرەکیی شـانۆنامەکە، ئومێـدی داهـاتووی گەلـی کـوردە. بەدۆ، دوای تەواوکردنـی خوێنـدن، دەبێتە دکتۆر و دەسـت بە پێچـانەوەی برینەکـانی گەلـی کـورد دەکـات و دەبێـتە دەرمانێـك بـۆ چارەسـەری تەواوی بـرینە رِەشەکان.

یەکەم جـار، سـاڵی ١٩٧١، مووسـا عەنـتەرم لە بەنـدیخانەی سەربازیی دیاربەکر دیت. لەوێ دەمێوە، یەکەم هەست و باندۆر کە مووسا عەنتەر لەسـەر مـن بەجێـی هێشـت ئەمە بـوو "خەم و کەسەر". زۆر بە خۆی و دۆخەکەی دڵتەنگ و بێتاقەت ببووم... مـن لەوێ دەمێـدا گەنجێکـی تەمەن ١٨ سـاڵان بـووم. ئەویـش ئـاپۆیەکی تەمەن ٥٥ سـاڵان. عەنتەر ئەودەمـی قژەکـانی سـپی ببوون. تەمەنی لاوی و ناوەرِاستی تەمەنی جێ هێشـتبوو و بەرەو ئیختیاری هەنگاوی دەنا. کاتێك زیـاتر و لە نزیکتـر ئەوم ناسـی، تێگەیشـتم زۆر بەهەڵەدا چـوومە. چـونکە مووسـا عەنـتەر بە دڵنیـاییەوە هۆکـاری خەمبـاربوونی مـرۆڤ نەبـوو. بەڵکـوو بە پێچەوانەوە، ئەو بەردەوام ئومێد و بەرخۆدانی لە ناخی مرۆڤەکان دەچاند.

مووسا عەنتەر، بە وتە و کارەکتەر و کردارەکـانی، ئومێـد و

بڕوا و گەرمییەکی بە بەندیخانە دەبەخشی. ئەو بەندیخانەیەی دەبوو تژی ترس و دوودڵی و نائومێدی بێ، عەنتەر کردبووی بە شوێنێکی زۆر پێچەوانەی ئەوە. ئیدی زیندان بۆ ئەو ببووە شوێنی پەروەردە و کەیف و خۆشی. گرتووەکان هەر کاتێك بێتاقەت و دڵتەنگ و نائومێد بانە، دەچوونە لای مووسا عەنتەر، ئەویش بە گاڵتە و چیرۆك و گۆرانی و حیکایەت و بەسەرهاتەکانی، هەرچی هەستی تاریك و ناخۆش هەیە لە لای دەرەواندنەوە. چونکە نووسەری (برینا ڕەش) بەردەوام بەدوای ئەو ئامانجانەیدا بوو، کە لەناو شانۆگەرییەکەیدا نووسیویەتییەوە.

(برینا ڕەش)، لەناو مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا خاوەن پایەیەکی بەرزە. هەوڵ و تەقەلای شانۆنامەکە، چونکە هەوڵی هەستکردن و زانینە بۆ ئەوەی سوودێکی گەورە بە گەلی کورد بگەیەنێت، بۆیە بایەخێکی مێژوویی و کۆمەلایەتی هەیە. هەموو ئەمانە وا دەکات بڵێین، بە دڵنیاییەوە نابێ مووسا عەنتەر لە بیر بکرێ، بۆ ئەمەش دەبێ بەردەوام کتێبەکانی چاپ بکرێنەوە و بخرێنە بەر دیدی خوێنەران.

**محەمەد ئوزوون[1]**

---

[1] محەمەد ئوزوون (١٩٥٣-٢٠٠٧): نووسەر و ڕۆماننووسێکی کوردی، هاونیشتیمانیی باکووری کوردستانە. دامەزرێنەری ڕێکخراوی پێنووسی کوردە لە سوید. خاوەنی زیاتر لە بیست پەرتووکە بە زمانی کوردی و زمانی دیکە. یەکەم ڕۆمانی بە نێوی (تۆ) لە ساڵی ١٩٨٥ بلاو کردەوە. هەروەها گەلێك لێکۆلینەوە و هەلبەستی نووسیوە. جگە لە زمانی کوردی، گەلێک بەرهەمی بە زمانی ئینگلیزی، سویدی و تورکیش نووسیوە. ئەمڕۆ هەندێک لە توێژەران، ئەو وەک سەرکێشی ڕۆمانی کوردیی مۆدێرن دەپەژرێنن و بەرهەمی ئەو لە ڕیزی ئەو بەرهەمانەن کە زۆر دەخوێندرێتەوە. بە هۆی خەبات و نووسین بە زمانی کوردی، چەند جار لە لایەن دەسەلاتی تورکیا خرایە بەندیخانەوە و هەر بە هۆی ئەم کێشەیەوە، هاوینی ساڵی ١٩٧٧ باکووری کوردستانی بەجێ هێشت و بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ لە ولاتی سوید مایەوە. لە سوید ساڵی ٢٠٠١، خەلاتی Torgny Segerstedtی سویدی وەرگرت. (وەرگێڕ).

## مووسا عەنتەر وەك ئەوەی من دەیناسم

لە سەردەمی ژیانی لاوییەتیم و لە دەستپێکی سەرقاڵبوونم بە کاروباری ویژە و نووسین، ناوی ئاپێ مووسام بیست. کتێبی (برینا ڕەش) یەکێك لە نووسراوە گرنگ و بەهێزەکانی بوو، لەوێ دەمێدا بە کورمانجی خوێندمەوە. لێرە نامەوێ باسی ئەو دەقە شانۆییەی بەر دەستتان بکەم، چونکە دوای هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەك، ئێوە خۆتان دەیخوێننەوە و تێدەگەن لەوەی مەبەست و ئامانجی ئەو دەقە جوانە و کارەکتەر و بەسەرهاتەکانی چۆنە؟ بۆیە من گەرەکمە زیاتر باسی ئەو نووسەرە تێکۆشەرە بکەم، کە شوێنێکی گرنگی لە ویژە و ئەدەبی کوردیدا هەیە.

مووسا عەنتەر یەکێکە لەو کەسانەی، بە هیچ شێوەیەك بیروباوەڕەکانی لەگەڵ ژیانی ئاسایی لە یەك جیا نەبووە. ئەو خەباتکارێکی گرنگی زمانی کوردی و بەدەستخستنی ئازادی بووە بۆ گەلی کورد. لە پێناو بیر و بۆچوون و باوەڕەکەشی، زۆر قوربانیی گەورەی داوە و ساڵەهای ساڵ، کەوتووەتە ناو زیندانەکانی دەوڵەتی تورك. جا ئێمە ئەوەش دەزانین، هەر لەو ڕێگایەشدا کۆتایی بە ژیانی هێندرا و بە ناحەق و بە غەدر کوژرا.

مووسا عەنتەر، کۆمەڵگای کوردیی لە باکووری کوردستان زۆر بە باشی دەناسی. دەیزانی دەردی کوردان لە پارچەی باکوور چییە و چۆنیش چارەسەر دەبێت؟ بۆیە بە نووسین و وتارەکانی، کە زیاتر لە ڕۆژنامەی (ئازادیا وڵات) بڵاو دەبۆوە، ئەدەبیاتی کوردی دەوڵەمەندتر کرد. ئەو چالاکوانێکی ڕێگای ئاشتی و ئازادی و بەرەوپێشبردنی گەلی خۆی بوو. بۆیە هیچ کاتێك ئامادە نەبوو بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی، دەست لەو دۆز و مافە ڕەوایانەی باوەڕی پێیەتی هەڵبگرێ.

هاوینی ساڵی ١٩٩٢، مووسا عەنتەرم لە ئیستانبوڵ دیت. بیرمە لەوێ دەمێدا چوومەماڵەکەی و بوومە میوانیان و چەندان دەمژمێر بەیەکەوەماینەوە. ئەو کەسێکی میواندۆست و کوردێکی ڕەسەن و مرۆڤێکی خۆشمەشرەب بوو. وەك چۆن لەسەر درێژەدان بە بیروباوەڕە کوردەوارییەکەیشی پێداگیر و توندبوو. ئاخافتنی ئەو، لە بارەی مێژوو و جڤات و سیاسەت و ئەدەبیات، بە شێوەی حەنەك و قسەی خۆش و گێڕانەوەی بەسەرهاتی سەیروسەمەرە، ستایلێکی تایبەت بە خۆی بوو و ئیدی ئەم شێوازە ببووە پەنجەمۆری ئەو.

مرۆڤ، دوای بینینی مووسا عەنتەر، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هەستی بەوە دەکرد کەسێکی زۆر گەورەیە و مرۆڤێکە لەناو مێژوویەکی پڕ ژان و دەرد و کەسەر هاتووە. وەلێ سەرباری هەموو ئەمانە، ئەو بەردەوام ئومێدبەخش بوو. وەك چۆن خۆشی، پارچەیەك بوو لە ئومێد و هیوا.

دوو مانگ دوای ئەو دیدارەی نێوانمان، هەواڵی کوشتنی ئاپێ مووسام لە کەناڵێکی تورکیدا بینی. بە ڕاستی سەرەتا نەمدەویست باوەڕ بکەم، وەلێ نووچەکە ڕاستییەکی تاڵ بوو و دەبوو دانی پێدا بنێم.

مووسا عەنتەر، لەگەڵ ئەوەی لە ژیانیش نەمابێ، وەلێ ئەو هێشتا هەر زیندووە. جا هزر و ئاخافتن و ژیانە پڕ بەرهەمەکەی بۆ ئێمە چرایەکە و ڕووناکیمان دەداتێ و بڕینی ڕێگاکانمان بۆ ئاسان دەکا. جا بە هۆی ئەوەی من تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، لەژێر هەژموونی ئەو خیانەتەم کە لە ئاپێ مووسا کرا. بۆیە ڕووداوی کوشتنەکەیم هێنا ناو یەکێك لە ڕۆمانەکانم بە ناوی (ئەوان چاوەڕێی کازیوەن). لەگەڵ ئەوەشدا، لەو باوەڕەدام ژیانی ئاپێ مووسا شایەنی ئەوەیە ببێتە ڕۆمانێکی سەربەخۆ و تایبەتیش.

ئەم وەرگێڕانەی محەمەد عزەدین بۆ (برینا ڕەش)، دوای خوێندنەوەی دەقە وەرگێڕدراوەکە بۆ دیالێکتی سۆرانی، دەتوانم بڵێم کارێکی فرەجوان و وردە. خوێنەرانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش، لەو ڕێگەیەوە زیاتر مووسا عەنتەر دەناسن. جا خوێندنەوەی (بیرەوەرییەکان)ی مووسا عەنتەر، کە ئەویش لە لایەن کاك محەمەد عزەدینەوە کراوەتە کوردی و ئێستا منیش لە بەر دەستمە و دەیخوێنمەوە؛ خوێنەر ئاشنای تەواوی ژیانی ئاپێ مووسا و هزر و بۆچوون و بەسەرهاتەکانی دەکات. بە خوێندنەوەی (برینا ڕەش)یش خوێنەری کورد شارەزای توانا ئەدەبییەکانی مووسا عەنتەر دەبێ، کە چۆن ئەو دەرد و برینانەی

پێچاوەتەوە و لە شێوازی دەقێکی ئەدەبی خستوویەتییە ڕوو.

من دەستخۆشی لە محەمەد عزەدین دەکەم، کە، ئەگەرچی دوو دیالەکتیکی یەك زمانیشن، ئەو بەرهەمە گرنگە کلاسیکییەی لە کورمانجییەوە کردۆتە سۆرانی. بەو هیوایەم ئەو جۆرە کارانە درێژەیان هەبێ و شوێنی خۆیان لەناو کتێبخانەی کوردی و لە دڵی خوێنەراندا بکەنەوە.

**ژان دۆست**
**بۆخوم – ئەڵمانیا**
**بیستوهەشتەمین ڕۆژی مانگی یازدەی ساڵی ٢٠٢٢.**

## پێشەکی

خوێنەرانی عەزیز...

ئەم کتێبەم ساڵی ١٩٥٩، ئەو کاتەی لە ژووری تاکەکەسیی ژمارە ٣٨ی گرتووخانەی حەربییەی ئیستانبوڵ دەستگیر کرابووم، نووسی. ئەوەی ئێوە لێرە دەیخوێننەوە، هەموویان بەسەرهاتی منن.

(برینـــــا ڕەش) لە ناوچەکـــــانی ڕۆژهەڵات زۆرن. هەر لە باپشکێو و وەرەم و گولی-یەوە بگرە، تا چەندان نەخۆشیی دیکە؛ لە هەمووشی گرانتر و هەشبەسەرتر، نەزانی و فەقیرییە. ئێوە لەو شانۆگەرییەدا، ئەو برینەڕەشانە دەخوێننەوە کە تووشی ئەو هەموو ئێش و ئازارەیان کردووین.

**مووسا عەنتەر**

**بیست و چوارەمین ڕۆژی یەکەمین مانگی ساڵی ١٩٦٥**

**سوعادییە - ئیستانبوڵ**

## ئەکتەرەکانی ناو شانۆگەرییەکە

زینۆ

برۆ

مستۆ

بەدۆ

سەعدۆ

سەرۆخان

کەلۆس

ڕەشۆ

خەنسێ

سلۆ

خۆرت

بەهار

**شوێنی ڕووداوەکە:** گوندێکی "بەگانە" بە ناوی زارزڵا، لە دەشتی دیاربەکر.

**سەکۆ:** ماڵی برۆی هەژارە، وەك سەپان لە لای بەگی لادێکە کار دەکات.

سەکۆکە بەو شێوەیە ڕێك خراوە.

ماڵەکە تاقە ئۆدەیەکە، ناوبڕێك بە خشت بەشێکی ئۆدەکەی بۆ ئاخوورِ لێ جیا کراوەتەوە، وەلێ ژوورەکە پیسە و بنمیچەکەی بە تەنیی ئاگردانێ ڕەش بووە. دەرەوەی ماڵەکەش، خشتی دیوارەکەی بە ڕیخ سواق دراوە.

**کەلوپەلی ناوماڵەکە:** نیوە گونییەیەك، ئاردی جۆی تێدایە و بە سنگێکەوە بە بەرزایی دیوارەکەدا هەڵواسراوە. سێ چوار لێف و دۆشەکی دڕاو و کۆن و چەند سەرینێکی پینەکراو، لەبن هەرزاڵێك پەستراون. ڕایەخێکی لە خوری چنراوی دڕاویش، بالینگانی لەسەر داندراوە. جگە لەمانە، بەرۆشێك و تەشتێکی قۆپاوەی کۆن، هێلەگێکی شکاو، کەپچەیەکی لە دار دروستکراو. لەگەڵ جەڕەیەکی ئاوی دەوکەلبوو، چاراوگێکی لە قوڕ دروستکراویش، بۆ ئاوخواردنەوەی مریشکان، لە بەردەم دەرگاکە داندراوە. لەبەر کۆلەگەی ژوورەکەش، کەونە کورتانێکی کەرێ داندراوە. زینۆ لەپێش گونییەکە، لەناو تەشتێك ئاردەکە لە هێلەگ دەدا. زینۆی ژنی برۆ، هەشت سکی کردووە. لە فەقیریانیش، هەر پێست و هێسك ماوەتەوە. ئەو

تەمەنـی ٤٥ سـاڵە، وەلـێ سەروسـەکوت و ڕوخسـاری وەك ٧٠ ساڵییەکە. زینۆ کراسـێکی ئاودامـانی سەرشـان دڕاوی، هەنیشـك پینەکراوی لەبەرە. پەشتەماڵێکی کۆنیشـی بەسـەر کۆشـی خـۆی داداوە. وەك جلەکانیشی، پشـتێنێکی کـۆنی لە پشـتی ئاڵانـدووە. لەسەریشی، پەشتەماڵێکی کۆن و لەسەر ئەویش، وەك هەموو ژنە گوندییەکانی دەشتی دیـاربەکر، کـۆفییەکی لەسـەرە. لەو دەمەدا برۆ، عەسایەکی لە دەستە و گاسنێکی لەسـەر شـانە و لە جـۆتی دەگەڕێتەوە ماڵ. لەگەڵ گەیشتنی، گاسـنەکەی سەرشـانی لەپـاڵ دیوارەکە دادەنێ و دەستەندووەکەشی بە سنگێك وەدەکـا. لەبەر ئەوەی زینـۆ دەسـتی لەنـاو هەویـردایە، بـرۆ لبادێـك بـۆ خـۆی ڕادەخـا. بـالیفێکیش دێنـێ و هەنیشـکی لەسـەر دەداتەوە و لێـی دادەنیشێ. برۆ تەمەنی پەنجا ساڵە. سەر و سیما و پێستیشـی لەبەر هەتـاو سـووتاوە. کراسـێکی سـپی لەبەرە، بەڵام لە کۆنییـان بـۆر بـووە. لەسـەر ئەویـش پـاڵتۆیەکی خەت سـۆری داڕزاوی لەبەر کردییە، لەژێرەوەش بێجامەیەکی لە پێیە. کڵاوێکـی لەسـەرییە، کە بـرۆ بە لنگەوقـووچی لەسـەری کـردووە و بە پیـنەوپەڕۆ پێچـراوەتەوە. چـاویلکەیەکی شکاویشـی لە چـاوە. بـرۆ ڕدێنـی هاتووە و بە هەموو شێوەیەك، پەرێشانی و بـارگرانیی ڕۆژگـاری بە ڕووانەوە دیارە.

بـاوکی زینـۆ، لە سـەروبەندی یەکەمـین جەنگـی جیهـان، چووبووە سەربازی و نەگەڕابـۆوە. پـاش چەنـد سـاڵێك، کاتێـك دایکیشی کۆچی دوایی کرد، زینۆ کەوتە ناو ماڵی بەگی زارۆڤا لە دیاربەکر. برۆ، زینۆی لە ماڵی بەگ خواستبوو. زینـۆ هەر لە بچووکییەوە سۆزی دابووە خۆی "ئەگەر هـاتوو ڕۆژێـك منـداڵم بوو، ئەوان دەنێرمە بەر خوێندن".

پاش ئەوەی زینۆ و برۆ هاوسەرگیرییان کرد، هەشت مندالیان بوو. وەلیٰ حەفتیان مردن و تەنیا کوڕێکیان مابوو. بۆیە زینۆ ئەوی خستبووە بەر خوێندن. بەدۆی کوڕی برۆ، ئەو ساڵە دەبوو قۆناغی ئامادەیی تەواو بکات.

* * *

زینۆ — برۆ دەستم بە ئارد و هەویرە، بۆیە سفرەیەك بۆ خۆت دانێ و نان و دۆ بخۆ. گەر حەز دەكەی سەلكێك پیازیش سپی كە و لەگەڵی بخۆ.

برۆ — دە باشە زینۆ باشە.

زینۆ — ئاخر من چۆن بتوانم ئەوەت بۆ بكەم برۆ؟ تۆزێك پێش ئێستا هاتمەوە. یانی بۆ فرێك دۆ، هەموو ڕۆژێك بەو پرچە سپییەمەوە، ماڵی خەڵكی خاوێن دەكەمەوە و زبڵیان فڕێ دەدەم.

برۆ — ئەی من زینۆ؟ وەلێ چی بكەین؟ ئەرێ هەر بە ڕاست، نامەكەی بەدۆت نەدا كەسێك بۆت بخوێنێتەوە؟ نەتزانی چیی گۆتییە؟

زینۆ — تاهوو، وەڵڵا لە بیرم كرد. ما ئەتوو چ هۆشت لەسەری مندا هێشتییە؟ كەحیا خوێندن و قوتابخانەی خۆی تەواو كرد و ئێستا كاری خۆی دەكات. ئینشاڵڵا لاوی منیش لەو ڕۆژانە دەگەڕێتەوە ماڵ. خۆ دیتت برۆ، تۆ دەتگوت با بەدۆ نەخوێنێ و نەچێتە مەكتەب...

برۆ — ها هۆۆ، جا ئەوە كوڕەكەت خوێندنیشی تەواو كرد، داخۆ دەبێتە چی؟ زینۆ دەزانی تۆ بووی خوو و تەبیعاتی ئەو كوڕەت تێك دا؟ برادەرەكانی ئەو، ئەوە دە ساڵە بۆ خۆیان

شوانی دەکەن. ئەورۆ ڕەجۆی کوڕی سەلۆ، بە دە بزنیش نالّێ مالات. ئێ ئەوەش هەمووی خەتای تۆیە، چونکە ئەتوو هەر بە مەکتەب و خوێندنت گرتووە. بریا ئەتووش ئەو پێنج ساڵە لە مالی بەگ نەبای و گوێت لە وشەی خوێندن و مەکتەب نەبایە.

زینۆ – ڕاستە برۆ، ئەو چەند ساڵەی لەگەڵ تۆ بەسەرم برد، هەمووی بەهەدەر چوو. تۆ تەمەشای خۆت بکە و سەیرێکی منیش بکە. ئەوە ٣٠ ساڵە لەگەڵ تۆ هاوسەرگیریمان کردووە، قەت جارێك کراسێك، پشتێنێك، کەوێیەك، یان نەعلێکت بۆ کڕیم؟ نەخێر. ما ئێمە ساڵێکیش وەك مرۆڤان ژەمێکی تێر نانمان خواردووە؟ نەخێر. ساڵ دوازدەی مانگێش وەکوو کۆیلە ئیش دەکەین، وەلێ دیسان ژەمێك تێر و ژەمێك برسیین. یانی ئەو بەرماوەی لە تاشتی مالی بەگ دەماوە، باشتر بوو، یان ئەو نان و پیاز و دۆیە ترشەی تۆ بە کاری شەو و ڕۆژ پەیدای دەکەی و تەنیا بەشی خۆت دەکا؟ (زینۆ بە پیشاندانی کەلوپەلەکانی ناو مالەکەی) دە تۆ لە مالوحالی خۆت بنۆڕە؟ ئەوجا لە سەروسەکوتی مە، ئاخر گەر هەرچیمان لەناو ئەو مالە هەیە بیفرۆشین، بە بۆچوونی تۆ دەکاتە پارەی ئەو پارچە قوماشە زیادەی بەگ لە ملی خۆی دەکرد و پێیان دەگوت (بۆینباخ)؟ هیچ باوەڕ ناکەم ئەو پارەیە بکات.

برۆ – ئەرێ ڕاست دەکەی زینۆ، بەلام لۆ وا دەزانی من نازانم تۆ پارەت زۆرە، وەلێ لە قرچۆکییان جلی تازە لەبەر خۆت ناکەی؟ جا سوێند بەسەری شێخی دەخۆم، ئەورۆ گەر هیچت نەبێ، نزیکەی بیست لیرەت هەیە. ئێ دەتۆش جلی تازە لەبەر کە، خۆ من ڕێم لێت نەگرتییە.

زینۆ – واهۆ واهۆ، نازانم چ بڕێم، کوڕە ئاخر پیاوەکە من ئەوەندە پارەم لە کوێ بوو؟ یانی پێت وایە من بە هێلکەی سێ مریشکان و ئەو تەشییەی بۆ خەڵکی دەڕێسم، ئەوەندە پارەم بەسەریەکەوە نابێ؟ ئاخر ماڵی حاجی فەرمانی، تازە بە تازە، بۆ کیلۆیەك هێلکە لیرەیەك دەدەن، کەچی لەو دەمەدا، مریشکە زەردەمان لە هێلکە چوویتەوە. دەزانی خودا دوو شت بەیەکەوە ناداتە فەقیران؛ یانی، گەر یەکێك بدا، ئەوەی دیکەت لێ دەستێنێتەوە.

برۆ – کچێ زینۆ کوو دەبێ؟ ئەو مریشکە قەت لەو سەروەختانە لە هێلکە نەچوویتەوە؟

زینۆ – وەڵڵا منیش هەر وا دەڵێم برۆ، بەڵام پێم وابێ ئەو مریشکەمان، فێر بووە دەچی و لە کۆریتی ماڵی مەلای هێلکەی دەکا. وەلێ ئەوێ ڕۆژێ هەمان شتم لە دایکی مەلای پرسی، کەچی ئەو سەت سوێند و قورعانی خوارد کە شتی وەها نییە.

برۆ – (بە پێکەنینەوە، بۆ سەرخستنە سەر زینۆ) هەممم. یانی ئێستا بۆ هەر کیلۆیەك لیرەیەك دەدەن ها؟ لە ڕاستیدا ئەوە پارەیەکی کەم نییە، بەڵام ئێستا لێت بپرسم هەر دەڵێی پارەم نییە.

زینۆ – جا هەر وایە. تخوا ئێستا وەك جاران هێزم لەبەر ماوە؟ ئاخر مانگی ڕابردوو بە تەواوی، بە هەزار بێنەوبەردە، یەلا توانیم پێنج کیلۆ خوری بڕێسم، ئەویش هێشتا تەواو نەبووە. کاری ماڵەوە و پرتەپرتی خەڵکی هەمووی لەسەر و کۆکلی منە.

برۆ – جا پێنج کیلۆ خوری کەمە؟ ئەوجا پارەی هێلکەشی بێتە سەر.

زینۆ – هێلکەی چی هێلکە؟! مانگی ڕابردوو پێنج هێلکەم بەس بۆ تۆ کولاندییە. کەچی من هێلکەیەکم لە دەوی خۆم نەنایە. تۆبە ئەستەغفیرولڵا. ئەوانەی دیکەش، فاتۆ خان کاتێ بردییە شار، سێ دانەی لێ شکاندن. یانی ماوە نۆ دانە. (لە هەمان کات زینۆ بە پەنجەکانی حیساب و کیتابی هێلکەکان دەکا) نا نا، هەشت دانە ماوە. ئێ هەر هەمووی ٥٠ هێلکە بوون. وا بزانم فاتۆ دانەی بە نیو مەجیدی[1] فرۆشتییە، چونکە بیست و یەك مەجیدیی بۆ من هێناوە.

برۆ – ئێ کەواتە بە خوری ڕستنەکانەوە، بووە نۆ لیرە و مەجیدییەك، ئێ بەس نییە؟!

زینۆ – برۆ ڕاست دەکەی پارەیەکی کەم نییە، وەلێ ئەتوو ئاگات لەوە نییە ئێستا هەموو شتێك زۆر گران بووە. ئەدی ماڵ پێویستی بە خوێ و ئاگر نییە؟ باوەڕ ناکەی چەند بە ڕەزیلی ماڵ بەڕێوە دەبەم، وەلێ دیسان زۆر شتمان بەش ناکا. ئاخر سەرباری هەموو شت، یەك دوو چراش لە ماڵە جیرانان دەستێنم تەنیا بۆ ئەوەی بگەینەوە سەری مانگ. چەند ڕۆژێك پێش ئێستا، بۆ ئەوەی کەرەکەت ناڵ بکەم، بە پاڕانەوە، ئەوجا عیسۆی کریفم ١٠ مەجیدیی لێ وەرگرتیمە.

ئەی کوڕەکەم؟ ڕاستە لە قوتابخانەیەکی وا دەمێنێتەوە کە

---

[1] مەجیدی پارەیەك بوو لە لایەن سوڵتان عەبدولمەجیدی ٣١مین سوڵتانی عوسمانلییان لە ساڵی ١٨٣٩ چاپ کرا. ئەم پارەیە تا سەردەمی گرتنی ئیستانبول لە لایەن ئینگلیزەوە کاری پێ دەکرا. دوای ئەوەی سەڵتەنەتی دەسەڵاتداریەتی عوسمانلی لە لایەن پەرلەمانی تورکیاوە هەڵوەشێندراوە، لیرەی تورکی شوێنی مەجیدیەی دوا دراوی عوسمانلییەکانی گرتەوە. (وەرگێڕ).

خوێندن و مانەوەی بە پارە نییە، وەلێ پێت وایە سەرباری لەوە داوای پارە ناکات؟ گەر باوەڕ ناکەیت، لە کەحیا بپرسە. لەوسال گەر هیچم بۆ نەناردبێ، سی تا چل لیرەم بۆ ناردووە.

برۆ — تۆ سەیرکە لە بیرم چوو ئەوە بپرسم، بە ڕاستی لەناو مەکتووبەکەی بەدۆ، شتێکی تێدابوو بە قۆچانی وەرگرتنی باجی ئاژەلان دەچوو. کەحیا نەیگوت چییە؟

زینۆ — ئەها ئەوە پێی نەگوتبووی چی بوو؟! بەڕێوەبەر بۆی ناردبووی و سلاوی بۆت هەبوو.

برۆ — بەڕێوەبەر چیی دەویست؟ ئەی سەروان و جەندرمە هیچیان نەگوتبوو؟

زینۆ — کوڕە سەروانی چی و جەندرمەی چی؟! ئەوە ئەو بەڕێوەبەرە نییە کە تۆ دەتەوێ، مەبەستم بەڕێوەبەری قوتابخانەیە.

(زینۆ لەو سەروبەندە، هەویرەکەی شێلابوو و بە پارچە قوماشێك سەری دادەپۆشت. دواتر لە پەقرەجە ئاوەکەی بەردەمی دەستی شوشت و بە بەروانکەکەشی وشکی کردەوە. ئینجا چووە بەرامبەر برۆ و لەسەر عەرزەکە دانیشت و دەستی بە پینەکردن و دوورینەوەی جلە شڕەکانی برۆ کرد).

برۆ — چ چ، جا مەکتەب بەڕێوەبەری هەیە؟! من خۆ وام زانی نامەکە لە لایەن توران بەگی مودیر ناحییەوە هاتووە، وا پێی دڵخۆش بووم. وای زینۆ وای، بەڕێوەبەری قوتابخانەی مندالان ها، وای لە عەقڵت!

زینۆ — ئێوە سەیری برۆ بکەن، بەڕێوەبەری قوتابخانەی بە دڵ نییە. ئاخر برۆ تۆ نازانی بەڕێوەبەری قوتابخانە، لە مودیر

ناحیەی زۆر گەورەترە؟ لە بیرمە خانمی گەورە ڕۆژێك گوتی: "ئەو منداڵانەی لە قوتابخانە دەخوێنن، دواتر دەبنە بەڕێوەبەری ناحیە".

برۆ – دە برۆ گیانەکەم. ئەو پیرەژنە چ دەزانێ؟ وەك ئەوەی ڕۆژێك لە کۆشکەکەی دەرچووبێ و چووبێتە ناحیە؟ وەڵلا دەڵێن توران بەگ ڕۆژێك چییە، نەچووەتە قوتابخانە. بەڵکوو سەر بە پارتی دیموکراتە[1] لە شاری قەیسەری، هەر ئەوانیش کردوویانەتە بەڕێوەبەری ناحیەی ئێمە. جا لە دنیا کەس هەیە لە بەڕێوەبەری ناحیە گەورەتر بێ؟ قەرەواش و خزمەتکاری هەیە. جگە لەمانە، شیر و پەنیر و ڕوون و هەنگوین و مریشکیشی بێ بەرامبەر بۆ دێ. ئەسپەکەشی هەر بە بەلاشە. جا دەزانی پرسی باخەکەیان، ئەوەی حەجگیلیان دایانە توران بەگ. چەند ڕۆژی ڕابردوو، گوندییەکانی لادێی قەربەتیلی بە شەڕ هاتبوون. زۆر تکا و ڕجایان کرد، ئینجا توران بەگ بە هەزار لیرە ئەوانی ئاشت کردەوە. جا دڵیان کێشی بوێ بە ویستی خۆیان تێی هەڵدەدەن. چونکە کەس ناتوانێ سکاڵا لە بەڕێوەبەری ناحیە بکات. جا گەر سکاڵاشی لێ بکەن بە هیچ ناچێت. چونکە کەس گوێی پێ نادات.

زینۆ – ئەوە شتێکی دیکەیە برۆ. حکوومەت ئەو شتانە نازانێت. بە بیرت نایەت مودیر ناحیە کۆنەکە، ناوی ئەتیلا بوو

---

[1] لە دوای پارتی گەلی کۆماری CHP، بە دووەمین پارتی سیاسی دادەنرێت لە مێژووی کۆماری تورکیا. پارتی دیموکرات دوای ماوەیەکی زۆری تاك پارتایەتی لە تورکیا، لە ساڵی ١٩٤٦ دادەمەزرێت، لە ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) دەبێتە فەرمانڕەوای تورکیا. لە ٢٧ مایسی ١٩٦٠ کودەتایەکی سەربازی بەسەردا دەکرێت و دوای لە دەستدانی دەسەڵات، پارتەکەش لە تورکیا دادەخرێت. (وەرگێڕ).

وا بزانم، لەسەر چەند شتێکی وەها سکالایان لێ کردبوو. دواتـر دادوەرەکان ئەویـان خسـتە زینـدان. وەلـێ هـیچ بەڕێـوەبەرێکی قوتابخـانە خـراوەتە بەنـدیخانە؟! جـا سـەرباری ئەوە، فەرمانـدە سەربازییەکان و والی و دادوەرەکان، بە مامۆستام نـاوی دەهێـنن و دەستیان ماچ دەکەن.

برۆ — ئای زینۆی بێعەقڵ. یانی من ئەو هەموو شتە دەزانم و حکوومەت نایزانێ ها؟ جا خۆ کاك تـوران ئەو شـتانە بە نهێنـی ناکـات. هەمـوو ئەو شـتانە لە بەر چـاوی عەریـف و سـەرۆکی کـۆمەڵەی پـارتی دیمـوکرات دەکرێـت. خـۆ بەڕێـوەبەری بەستەزمان نـاچێ لە ئەنـقەرە ڕوون و هەنگـوین کـۆ کـاتەوە تـا حکوومەت ببینێ.

زینۆ باوەڕ ناکەی، سەرباری ئەو داهاتە زۆرەی بەڕێوەبەر، لە بری ئەوەی باجی لێ بستێنن، کەچی مووچەشی دەدەنـێ. تـۆش هێشتا بڵێ بەڕێوەبەری قوتابخانە گەورەیە.

زینۆ — وەڵـلا بـرۆ مـن سـەرم لەو شـۆلانە دەرنـاچێ. وەلـێ کاتێك لە ماڵی ئاغا کارم دەکرد، کەمال پاشا سـاغ بـوو، نە ئەو دیموکراتـانە هەبـوون، نە ئەو سـەرۆکی ڕێکخـراو و کـۆمەڵانە هەبوون و نە دزی و بەرتیل. ما سـووچی حکـوومەتی فەقیـرە؟! ئێسـتا دۆخەکە ئێسـتا ئەوهـای لـێ هـاتییە؟ ئەوەی مـن دەیـزانم ئەوەیە، بەڕێـوەبەری مەکـتەب، زۆر ڕێکوپێـك و خـاوێن بـرۆ. وەلـێ ئەوەی مـن بـزانم، دزی دوایـی نـایەت. ئەی تـۆ خـۆت نەتدەگوت، دز ماڵ بـۆ خۆیـان نـاکەن و دەچـن مـاڵی خەڵکـی خەراپ دەکەن؟

بـرۆ — کچـێ زینـۆ، ئێسـتا هەمـوو شـتێك لە دەسـت ئەو

دیموکرات و سەرۆك کۆمەڵانەدایە. یانی ئێستا وەکوو پێشوو، حکوومەت فەرماندە و سەرکردە دروست ناکات، بەڵکوو ئەو سەرۆك کۆمەڵە و بەرپرسە حیزبییانە دروست دەکەن. جا لەبەر ئەوەیە حکوومەت لەوان دەترسێ. هەتا سەروانیش لەوان دەترسێ.

(لەو کاتەدا، زەرۆکی کچە دراوسێیان، لە دەرگا دەدا و دێتە پێش، وەلێ بە دیتنی برۆی، شەرم دەکا و دەگەڕێتەوە).

زینۆ – زەرۆ وەرە کچی خۆم، وەرە کەسی بێگانەی لێ نییە. ئەوە برۆی مامتە.

زەرۆ – (بە شەرم و هێمنییەوە) مامۆژن دایکم گوتی: با مەتکت قاپێك ئاردمان بە قەرز بداتێ.

زینۆ – کچی خۆم بە سەری بەدۆی نیتمان، چما ئەگەر هەبێ شەرم نییە نەتاندەمێ؟!

(کچەکە بەپەلە دەچێتە دەرێ و دەڕوا).

برۆ – زینۆ ئەو کچە کێ بوو و چیی دەویست؟

زینۆ – ئەوەبوو........ ئەتوو بلێ، کچی نەیۆی بوو، قاپێك ئاردی بە قەرز دەویست.

برۆ – ئەی تۆ بۆ نەتدایێ؟

زینۆ – جا ئاردی من چۆن بۆ ئەوان دەبێ بڕۆ؟ ئەوان ئاردی گەنمی دەخۆن.

برۆ – گوێی مەدەرێ زینۆ، دیسان جۆی ئێمە لە گەنمی ئەوان باشترە. ئەوساڵ ئەوە چەندەمین ساڵە دەیخۆین، ئەو نەخۆشییە نەعلەتییەی پێی دەڵێن (برینا ڕەش) قەت دیتووتە تووشمان بێت؟! بۆیە نە نانی گەنم و نە برینا ڕەش. ئەو ڕۆژە بەلای ماڵی خاڵۆ خەلیلیدا تێپەڕیم؛ کچە نەساغەکانی هاتنە پێشم، وەڵڵا گایەکانیشم لێیان ترسان. جەرگم ژانی کرد، بەستەزمانانە، نازانی مرۆڤن یان بوونەوەرێکی دیکەن.

ڕاستە ئێمەش زۆرمان منداڵ مردووە، جا منداڵن و هەر دەمردن، بەڵام بەو شێوەیە نا. ئەو بەستەزمانانە بە زیندوویەتی، پارچەپارچە گۆشتیان لە جەستەی دەبێتەوە. چەند ڕۆژێك پێش ئێستا، سەگبانی کوڕی کەلۆسی ئەمری خودای کرد، مەلا لەسەر دەرگایرا دەیشووشت. بە چاوەکانی خۆم لاشەکەیم دیت. وەلێ یا ڕەبی کەس نەیبینێ، ئەو سەگبانەی دەتگوت مانگە، تەنیا پارچە هێسکێکی ڕەشی لێ مابۆوە. بە ڕاستی نەمناسییەوە.

زینۆ – برۆ خۆ دیتت، تۆش دەڵێی منداڵە و هەر دەمرێ. ئاخر بۆچی ئەو منداڵانە بمرن. من چەند ساڵان لە ماڵی بەگ مامەوە، نە جارێك بینیم یەکێکیان بمرێ، نە منداڵێکیان. ئەوانەی ئێمەش، بەردەوام لە برسان و لە سەرمان و لە بێ خزمەتییان و لە بێ زانیارییان و لە فەقیرییان دەمرن. ئاخر من ئەوەی باش دەزانم، چونکە حەفت منداڵم مرد و تەنیا بەدۆم لە بۆ ماوەتەوە.

برۆ – کچێ زینۆ، ئەوانە کاری خودان، فەرمانی ئەویشە. جا

خۆت دەزانی، منداڵ گوڵی بەهەشتێنە، ئێ خۆ بەهەشت نابێ بێ گوڵ بێت؟

زینـۆ – ڕاسـتە ئەوە فەرمـانی خـودایە و بە قوربـانی ئەو فەرمانەی بم، بەڵام بۆ فەرمانەکەی تەنیا بۆ ئێمەی فەقیرە؟!

برۆ – زینۆ سەیرکە، ئیدی خەریکە کفر دەکەی هـا! بـا ئەوماڵەت بەسەردا نەڕووخێ. دەست لە کاری خودای مەدە.

زینۆ – نا بابۆ نا! خۆ چیمـان گوتـووە؟! بە قوربـانی خـودای بم، وەلێ ئەویش عەدالەتەکەی.........

برۆ – وەڵلاهی زینـۆ زۆر عەجـابیی ئەتـوو. کچـێ گەر ئەو هەموو منداڵەمان نەمردبا، لە کوێ جێیان دەبۆوە؟! جا تۆ سەیری ئـێمە و ئەو دراوسـێیانە بـکە، بەیەکەوە نـزیکەی ٣٠ – ٤٠ زارۆکمـان مـردن. هەر بە ڕاسـتییش زینـۆ، گەر هاتبـا و ئەو منداڵانە ژیابانا، ئێستا هەر چواردەورمان بە گەنج تەوق دەدرا.

زینۆ – وەلێ ئەو برینە ڕەشە، لە نانی گەنمەوە نییە. چـونکە دەڵـێن ئەو بـرینە ڕەشـە لەو گەنمـانە سـەرچاوەی گرتـووە، کە حکـــوومەت بنەتـــۆیەکەی داوەتە خـــاوەنی لادێ و بەگ و ئاغاکان.

برۆ – جا ئەو بـرینە ڕەشـە کـوا لە بنەتـۆی گەنـم دروسـت دەبـێ؟! بیـرتە چەنـد سـاڵێك بەر لە ئێسـتا نـزیکەی گـونیەیەك گەنمی بنەتۆمان زیادی کرد و بردمانە ئاش و لێمان کرد. بیـرتە لەوێ سەردەمێدا، بەدۆش منداڵ بوو. جا ئەویش لە نانی ئـاردی ئەو بنەتۆیەشی خوارد و هیچ برینی ڕەشیشی لێ پەیدا نەبوو؟!

زینۆ – برۆ ئەو بنەتۆیە، بە بنەتۆیەکەی ئێمە نـاچێ. چـونکە

حکــوومەت ئەو بنەتۆیــانەی داینــێ، بــۆ ئەوەی بیچێنــین، هەر بۆیەش بە دەرمانکراوی دابەشــی کــردووە. وەلــێ ئەوان لە بــری ئەوەی بیچێــنن، دەچــن لە بــازاڕ بە هەرزان دەیفرۆشــنەوە. لــێ دانەوێڵەفرۆش و عەلافەکانیش، ئەو بنەتۆیــانە بە نرخــی جــۆ، بە هەژار و ڕەشــوڕووتان دەفرۆشــنەوە. جــا چــی دەبــێ، خــۆ حکوومەت بە بەلاشی داونەتێ. یانی، ئەوەی ئەو بــرینە ڕەشــەی دروست کــردووە، ئەو دەرمــانەیە کە لە بنەتــۆیەکە دراوە. هەتــا دەڵێن دەرمانەکە هەر ژەهرە.

برۆ - کچێ دە بەسە زینۆ ئەتــووش. خــۆ حکــوومەت شــێت نیــیە ژەهرخواردمــان بکــا. ئــێ گەر ئــێمە بمــرین کــێ دەچێــتە سەربازی؟ کێ باج دەدا؟ وەڵلا با پێت بڵێم دوژمن تا ئێرە دێت و هەموومان ڕووت دەکاتەوە و ئینجا دەمانکوژن.

زینۆ – برۆ ڕاست دەکەیــت، حکــوومەت ئــێمە ژەهرخــوارد ناکا، وەلێ ئەوانەی گەنمەکەیان وەرگرتووە، بۆ قازانجی خۆیان ئێمەیان ژەهرخوارد کردووە.

بــرۆ – ئەوەش هەر درۆیە. خــۆ تــۆ بینیــت بەهــاری پــار، لە سەرەتای مانگی پێنج، ئەوکاتەی چوومە دیــاربەکر، جــۆ گــوڵی کردبــوو. بیــرمە لەگەڵ بەگ چــووینە بــازاری دانەوێــڵە. لەو گەنــمەی حکــوومەتی کە تــۆ باســی دەکەی، بەگ ۱۰۰ تەنــی وەرگرتبوو و هەمووی لەوێ فرۆشتەوە.

زینۆ- ئەی چۆن؟! ئەی من پێت نــاڵێم ئەوان دەیفرۆشــنەوە؟! جا حکوومەت نازانێ و وا دەزانێ گەنمەکە دەچێنن!

برۆ – هەڵلا هەڵلا! ئەرێ بۆ خاتری خوا حکوومەت شــێتە؟! چۆن نازانێ لە مانگی پێنجدا لە دیاربەکر گەنم تــۆ نــاکرێ. جــا

لەوەیە ناوی گەنمەکە (گەنمی بنەتۆ) بێ. یانیش بۆ ئەوەیە ئەو گەنمە بۆ تۆکردن بەکار بهێنن. لەسەرێکیش حکوومەت لەسەر حەقە، ئێ خۆ ئەوان وەك ئێمە نانی جۆ ناخۆن گیانەکەم.

زینۆ — تۆ گوتت چەند تەن؟

برۆ — ١٠٠ تەن. هەر بە ڕاستی زینۆ ئەو پرسیارەت یانی چی؟! خۆ تۆ ئەو شتانە دەزانیت. ئەی خۆ حکوومەت بە کیلۆ قسە ناکات.

زینۆ — نا گیانەکەم خۆ دەزانم کیلۆ و شتی وایان نییە، وەلێ منیش زۆر باشی لێ نازانم. چونکە ئەو کاتەی لە مالّی بەگ بووم، تەرازوو و وەزن و بارکێش هەبوو، وەلێ قەتم تۆن نەدیت، بەڵام گوێم لێ دەبوو جار نا جار، خانمی گەورەمان باسی تۆنی دەکرد.

(لەو کاتەدا مام مستۆ دێتە ژوور و سڵاو لە برۆ دەکا، برۆش بەپێی دابونەریتی لادێ، لەبەری هەڵدەستێتەوە و فەرمووی لێ دەکات، وەلێ مستۆ هەر زوو لەسەر عەردەکە دادەنیشێت).

مستۆ — برۆ تازە لە جۆتی هاتییەوە؟ باشە بۆ وەها بە درەنگ کەوتی؟

برۆ — ئەرێوەڵلا مستۆ. ئێ کاکە من چی بکەم؟! برا، گاکانم برسی و قەڵسن، بۆیە باش ئیش ناکەن.

(برۆ لەبەر مستۆ هەڵدەستێتەوە و شوێنەکەی خۆی دەداتێ. وەلێ مستۆ هەر لە شوێنەکەی خۆی دەمێنێتەوە).

برۆ — دە فەرموو وەرە سەر ئەو نیمدەرەی.

مستۆ — ناوەڵلا ئێرە فێنکترە و خۆشتریشە. ئەتۆ لە جۆتی هاتییەوە و ماندووی، تۆ لەوێ دانیشە. ڕاستە جۆتی بەهارێ زۆرە، وەلێ زۆر باشە. ئەی وا نییە خوشکی خۆم زینۆ؟

زینۆ — ما لە کوێ بزانم کاکۆ؟! ئەوە ۳۰ ساڵە برۆ بەردەوام ماندییە. سەرباری کار و کاسبیی خۆی، حاڵی ئێمەش دەبینی چۆنە؟! بۆیە گەر جۆتی بەهارێش باش بێ چ سوودی هەیە، یان گەر خراپ بێ چەندە لەوەی خراپتر دەبێ؟!

مستۆ — وەڵلا ڕاستە خوشکم، بەڵام ئەی ئێمە چی بکەین؟! دەستوپێمان بەستراوەتەوە و ژیانیش هەروا ئاسان نییە.

زینۆ — بۆچی وا دەڵێی کاکۆ، وەڵلا ئەوەی بزانێ ئێستا ژیان زۆر ئاسانە. ئەو ڕۆژە ئەحۆ چووبووە کۆبوونەوەی دیموکراتان لە ناوچەی بسمیلێ. کە هاتەوە کەس نەیدەزانی چەندی شتومەك هێنابۆوە. هەتا چایدانیشی هێنابوو. ئێستا ئەحۆ هەموو سبیانان، چای بۆ منداڵەکانی لێ دەنێ.

مستۆ — ڕاستە خوشکی خۆم، کاری حیزبایەتی وەهایە. وەلێ من و برۆ ناتوانین ئەوە بکەین. ئەو کارانە پێویستی بە زمانزانینە. هەر بە ڕاست من هاتم تا لە منداڵەکەتان بپرسم، لەسەر خێران کەی دێتەوە؟

زینۆ — خوا لێت ڕازی بێ. ڕەنگە چوار پێنج ڕۆژی دی

بێتەوە. ئەی ئەو هەواڵەت لە کێ زانی جیران؟

مستۆ — کەحیا وای گوت.

زینۆ — ڕاستە، هەر ئەویش نامەکەی بۆ خوێندمەوە.

مستۆ — ئەرێ بەدۆ دەمێکە دەخوێنێ، ئەوە بووە چەند ساڵ؟

زینۆ — بووە ١١ ساڵ مامە. وەلێ ئەوە خەریکە قۆناغی ئامادەییش تەواو دەکا.

مستۆ — برۆ ئامادەیی چییە؟ ئەویش مەکتەبە؟

برۆ — بابی بابم وەڵلا من نازانم، تۆ ئەو شتانە لە زینۆ بپرسە.

زینۆ — بە دڵنیاییەوە دەزانم. ئامادەیی گەورەترین قوتابخانەی دیاربەکرە. بەگمان چەند هەوڵی دا، نەیتوانی قۆناغی ئامادەیی بە مەتە و جەنگیزی تەواو بکات.

برۆ — مستۆ تۆ لە عەقڵی زینۆی بنۆڕە. منداڵەکانی بەگ ئامادەییان تەواو نەکردییە، بەڵام زارۆکی زینۆ ئامادەیی تەواو دەکا! بۆیە گەر وەهابێ، دەبێ ئامادەیی شتێکی باش نەبی. ئاخر زینۆی سەربەهەش، گەر ئامادەیی شتێکی باش با، ماڵی بەگان بۆ ئێمەیان دەهێشتەوە؟!

مستۆ — ئەرێ زینۆ خان، ئەو منداڵانەی ئامادەیی تەواو دەکەن دەبنە چ؟

زینۆ — کاك مستۆ دەبنە هەموو شتێك، بەڵام کوڕەکەی من دەڵێ، دەمەوێ دوای ئامادەیی بچمە ئیستانبوڵ و خوێندن لەوێ تەواو بکەم.

برۆ — هەر ئەوە مابوو، تۆ سەیری ئەوە بکە. هەموو شتێکی

بەلاوە ئاساییە. باشە زینۆ ئێستا بەدۆ دەتوانێ ببێتە جەندرمە یان سەروان؟

زینۆ – برۆ بۆ خاتری خوا تۆ شێتی، خانمی گەورە گوتی، بەدۆ بەگ دەتوانێ بچێتە کۆلێژی سەربازی و ببێتە ئەفسەر. هەر لە ئێستاوە تەواوی ماڵی بەگ بە کوڕی من دەڵێن (بەدۆ بەگ).

مستۆ – بۆ خاتری خوا زینۆ، لێ مەگەڕێ بە کوڕی تۆ بڵێن بەدۆ بەگ. بۆ نازانی ئەو بەگانە چییان بەسەر ئێمەی هەژار هێناوە؟

زینۆ – کاکی خۆم وەڵلا ڕاست دەکەی، بەڵام وەك گوتم، ئەوان پێی دەڵێن بەگ.

برۆ – دە واز لە زینۆ بینە ئەتووش. هەموو خەڵك بوونە خاوەن ژن و ماڵ و منداڵ و مێگەل و دەوار، کەچی زینۆ هێشتا بەدوای قسەی خانمی گەورە کەوتووە.

(برۆ بە پێکەنین و چاوتێبڕین لە مستۆ) خوا من بگرێ، وەك ئەوەی لە زۆزانەکانی دیاربەکر کچ نەمابێ، چووم و زینۆی خانمی گەورەم هێنا.

زینۆ – (بە پێکەنینەوە) برۆ قسەکەی تۆ ڕاستە. جا تۆ ئێستا هەر چی بڵێی دروستە. چونکە پێ دەچێ ئەو هەموو ڕجا و تکا و پاڕانەوانەت لە بیر چووبێتەوە. وەلێ چ بکەم، بە قوربانی بەدۆی بی، ئەگەرنا دەمزانی چیم دەکرد.

مستۆ – نا نا خوشکە زینۆ، ئەو قسەیەت بە پێچوپەنابوو. ئەگینا دەزانم برۆت زۆر خۆش دەوێ.

زینۆ – چی بکەم برا گیان. خۆ هەموو ڕۆژێك وەکوو

مەردووم، ماڵ و حاڵم ناگۆڕم؟! برۆ باوکی بەدۆی کوڕمە و ۳۰ ساڵە بەیەکەوەین و ڕەنگی یەکمان گرتووە، ئەگینا خۆ عاشقی چاوەکانی نیمە.

(کاتێك زینۆ ئەم قسانەی دەکرد، برۆ وەك منداڵ بە شەرمەوە سەری لەبەر خۆی نابۆوە).

مستۆ – نا نا زینۆ خان، هەر بۆ شۆخی ئەو قسانە دەکەم؛ بە دڵنیایەوە ئەوهایە. کاتەکەی درەنگ بوو، منیش هاتم ویستم هەواڵی بەدۆ بزانم. بۆیە لەسەر خاتری ئێوە ئەوە من هەستام.

(برۆ ئەو نان و پیاز و دۆیەی لەبەر هاتنی مستۆی دابوویە لایەکی، دەبیاتە پێش مستۆ و ...)

برۆ – وەڵلا لە بیرم کرد، توو و خاتری خودا مستۆ گەر دانەنیشیت و نانەکەم لەگەڵ بخۆی.

مستۆ – سوێندی لەسەر مەخۆ. بە خوا من لە ماڵەوە نانم خوارد، ئینجا هەستام و هاتمە لای ئێوە.

برۆ – مستۆ سەیرکە پیازیش هەیە، بە خوا دەزانم چاوت لێیەتی.

مستۆ – وەڵلا ڕاست دەکەی برۆ، بەلام بەر لەوەی بێم، منیش پیازم خواردبوو. فەرسۆش دەزانێ زۆرم حەز لە پیازە،

بۆیە هەندێك جار لەناو ئاوایی چەند سەلکێکم بۆ پەیدا دەکا. یانی تۆ ساخ بی، ئەوساڵ تێر پیاز بووینە. ئەوساڵ ئالیکی زیادم هەبوو، بۆیە هەر کات بۆ ئالیکفرۆشتنێ چووباما قەزای، یەك دوو کیلۆ پیازیشم دەکڕی ئینجا دەهاتمەوە.

برۆ – نۆشی گیانت بێ مستۆ. وەلێ تۆ دەزانی من ناچمە چ جێگایان، زینۆش دەزانێ. بۆیە ئەو چارەی ئەو ئیشانە دەکا، پێم وابێ ئەو پیازانەی لە پارەوە هەڵگرتبوو. وەلێ بە داخەوە ئیدی خەریکە لە جێی خۆیان شین دەبنەوە.

زینۆ – لە کوێ؟ وەڵلا ئەوانەی منیش تەواو بووینە، لە چەند سەلکێك بترازێ. ئەوانیشم بۆ کاتی هاتنەوەی کوڕەکەم شاردۆتەوە، تا هەندێك دۆغەوای بە هێلکەی پێ لێنێم.

مستۆ – ها ها ها، خوشکە زینۆ واتا باراشیشت مایە.

زینۆ – نا بە خوا کاکۆ، ڕەنگە هەر چەند مشتێك هورتکە ساوار و پیرخەنیم مابێ. ئەویشم لە ترسی برۆی شاردیتەوە، ئاخر ئەگەر بیزانیبا ئێستا ئەویشی پێ کردبوومە چێشت.

مستۆ – دەی دۆستینە من ڕۆیشتم، لەسەر خاتری ئێوە.

(زینۆ و برۆ، لەگەڵ مستۆ هەڵدەستن و تا بەر دەرگا دەچن و بە ڕێی دەکەن. دواتر بەیەکەوە دەگەڕێنەوە هوندوور. ئینجا زینۆ دەست دەکاتە تەشییەکەی و دەست بە ڕێستنێ دەکا. برۆش کورتانی کەرەکەی دێنێتە پێش خۆی و دەست بە چاککردنەوەی دەکا).

زینۆ – ئەرێ برۆ گەر کوڕەکەمان هاتەوە بۆ نان چ بکەین؟

برۆ – بۆچی ئەو پرسیارەی دەکەی، ئەی ئەوەی لەناو ئەو گونیەدایە ئارد نییە؟

زینۆ – با ئاردە، وەلێ کوڕەکەمان ئاردی جۆ ناخوا!

برۆ – دە بەسە تۆش. لە خوتوخۆڕایی ئیشم لۆ مەبینەوە. جۆ و مۆ، نانی ماڵی باوکییەتی و دەبێ بیخوا. ئاخر ئێستا لە کوێ گەنمتان بۆ پەیدا بکەم؟!

زینۆ – برۆ بە قوربان، ئەوها نابێ و زۆر زەحمەتە. ئاخر ئەو کوڕە چەند ساڵە فێری نانی گەنم بووە. ئێستا چۆن دەتوانێ نانی جۆ بخوا؟ ڕەنگە پێی نەخۆش بکەوێ. ئەی تۆ بە بیرت نایێ، ئەو ساڵەی منت هێنا، لەبەر ئەوەی لە ماڵی بەگ فێری خواردنی نانی گەنم ببووم، کە هاتمە لای تۆ و نانی جۆم خوارد، نەخۆش کەوتم و خەریك بوو بمرم.

برۆ – ئەی من چی بکەم و چیم لە دەست دێ؟ تۆ پارەت هەیە، ماڵی بەگیش گەنم دەفرۆشن. دە هەڵستە و بڕۆ بۆ کوڕەکەت بیکڕە. خۆ من ڕێم لێ نەگرتووی؟

(زینۆ لەبەر پشتی، کیسە باخەڵێك دەردێنێ. ڕووی خۆشی لە برۆ وەردەگێڕێ، هەتا نەیبینێ. لەناو کیسە باخەڵەکە، پازدە لیرە دەردەهێنێ و دەیداتە برۆ).

زینۆ – ئەوە ١٥ لیرە، برۆ بایی ئەوەندە گەنم بکڕە، بەشی

دەکا. من و تۆش هەر بە دزیی ئەو ئاردی جۆیەکە دەخۆین. بەس برۆ توو سەری بەدۆی کوڕمان، با ئەو نەزانێت. چونکە خۆت دەزانی کوڕەکەم زۆر دڵناسکە. ئەگەر بزانێ ئەو نانی گەنم دەخوا و ئێمەش نانی جۆ، لە حەژمەتان نەخۆش دەکەوێ.

سەکۆ: دووبارە ماڵی برۆی هەژارە.

بەدۆ لە مەکتەب گەڕاوەتەوە و بە بەرگی قوتابخانە لە تەك دایکی لەسەر بالیفێك دانیشتووە.

زینۆ لە بن دیوارە قوڕینەکە تەشی دەڕێسێ. بروش لەسەر لبادێك لێی پاڵ کەوتووە و هەنیشکی لە زەوییەکە گیر کردووە و دەستی خستۆتە پشت سەری و بە کەیفەوە سەیری ژن و کوڕەکەی دەکا. جلەکانیشی هەر وەك خۆیەتی.

(هەرسێکیان دەمەتەقێیەکی خێزانی دەکەن)

برۆ – زینۆ دەبینم زۆر کەیفخۆشی؟

زینۆ – ئەرێ برۆ یانی نابێ دڵخۆش بم؟ ماشەڵڵای لێبێ کوڕم دەڵێی شێرە و وا لە تەنیشتم دانیشتییە. جا تۆ بڵێی لە تەواوی ئەو سەردەمە کەسێکی زانا و زیتەڵەی وەك کوڕی من هەبێ؟

برۆ – های هۆۆ لەدەست تۆ زینۆ. کوڕی تۆ زۆر زیرەکە ها؟ ئەها خۆی لێرەیە، پار ڕۆژێك لەگەڵ خۆم بردمە جۆتی، نیر و گاسنی بەرەوپاش خستە سەر ملی گاجووتان.

بەدۆ – یابۆ ئاخر ئەوکات یەکەم جارم بوو. دە تۆ ئێستا لەگەڵ خۆت بمبە، بزانە چەند بە جوانی دەیکەم.

زینۆ – نا کوڕی خۆم نا، لێی گەڕێ و هەر فێری جۆتکردنیش مەبە. جا باوکت ئەوە ٤٠ ساڵە خەریکی ئەو

ئیشەیە و بێپسانەوە دەیکات، ئێ دە سەیرکە و بزانە چیی بە چ کردووە؟ جا دەشڵێن ماڵی بەگ بە تەمان واز لە باوکت بێنن و چی دی جۆتی پێ نەکەن، چونکە بە نیازن کەرستە و ئامێری جۆتکردنی نوێ بکڕن.

برۆ – ئەوە کوو دەبی زینۆ؟ ئاخر کوو ئامێری جۆتکردنێ دێنن؟ ئەدی ئەو هەموو گوندییە ڕوو کوێ بکەن؟

زینۆ – دەچنە کوێ با بچن، بەگ چ ئیشوکاری نییە خۆی بە وانەوە مژوول دەکا؟ جا سەرباری ئەوانەش، بەگی ئێمە لە بەگی خەڵك زۆر چاکترە. بەگی گوندی دیکە، ئەوە چوار پێنج ساڵە ئامێری جۆتکردنیان هێناوەتە گوندی. جا هەر بۆ خۆشیان عەردەکانیان تۆ دەکەن و هەر خۆشیان دەیدوورنەوە. گوندییەکانیش ناچار کۆچیان کرد و ڕوویان لە شاری کرد. لەوێش، ئەوەی مرد مرد، ئەوەی دیکە زۆربەی بووە دەرۆزەکەر. لەو چەند ساڵەی ڕابردوو، دیاربەکر پڕی دەرۆزەکەر بووە. ئیدی مرۆڤ شەرم لە خۆی و لەوانیش دەکاتەوە. وەلێ ئەو قوڕبەسەرانە چ بکەن؟ لە دیاربەکر هیچ ئیشەك نییە تا بیکەن، ئیدی ناچار دەرۆزەی دەکەن.

برۆ – من لەو باوەڕەدا نیم حکوومەت بهێڵێ ئەو بەگانە، وا بکەن گوند چۆڵ بکرێ.

زینۆ – بەدۆ ئەتوو لە عەقڵی بابت بنۆڕە. برۆ خۆ حکوومەت کەر نییە نەهێڵێت؟ تاپۆی گوند لە باخەڵی بەگدایە، حەزی لە چی بێ دەیکا و کەسیش ناتوانێ خۆی تێهەڵقورتێنێ. جا حکوومەت هەر خۆی تراکتۆر و ئامێری تۆکردنیان دەداتێ. وەك چۆن بنەتۆشیان دەداتێ بۆ تۆکردن، وەلێ کە خۆیان تۆی

ناکەن و دەیفرۆشنەوە، ئەوە شتێکی دیکەیە.

برۆ – وەڵلا بڵێم چی، دوعای بکەن خوا سەریان بخوا. ئەدی تۆ لە چی دەترسێی؟ چونکە بچینە هەر کوێیەك، بارودۆخمان لە ئێستا خراپتر نابێ.

زینۆ – چۆن، حاڵی لەوە خراپتر نییە برۆ؟ هیچ نەبێ ئێستا لە گوند، لە ماڵی خۆماندداینە و کەس بەناو ماڵمان نازانێ. بەڵام گەر سبەینێ لە شار بکەوینە سەر شەقام، چۆن لەوە خراپتر نابین؟ چ شتێك لەوەی ماڵوێرانیترە مرۆڤ خۆی داوای ئەوە بکات ببێتە دەرۆزەکەر؟! ڕاستە گوند هی ئێمە نییە و خانووش ماڵی ئێمە نییە، بەڵام حەفت منداڵم لەناو گۆڕستان هەیە، ئاخر چۆن ئەوان جێ بهێڵم و من بچمە کوێ؟!

برۆ – دە بەسە تووخوا، دیسان باسی مردووانت کردەوە. خۆ تۆ چ جاران باسی شتێکی خۆش ناکەی.

بەدۆ – بابۆ تۆ حەز دەکەی من ببمە چی؟

برۆ – عەریفی جەندرمەی.

بەدۆ – یانی چۆن بابۆ؟ ئەوجا عەریفی جەندرمەی چییە؟

برۆ – یانی چۆن بەدۆ، ئەتوو هێشتا گەورەتر دەبی؟

زینۆ – برۆ ئەتۆ بۆ تێناگەی، کوڕی من زۆر گەورەتریش دەبێ؟

برۆ – دە هەیهۆ زینۆ هەیهۆ، ئێستا دەڵێی کوڕی من دەتوانێ ببێتە مودیر ناحییەش.

بەدۆ – بەڵێ بابە دەتوانم ببمە مودیر ناحیەش، وەلێ هێشتا

شتی گرنگتر و بەفەرتر هەیە. بۆ نموونە دکتۆر، ئەندازیار، دادوەر، پارێزەر...

برۆ – لاوی خۆم، وەللا تۆش وەك دایكی خۆتی. كەی دەتكەنە ئەو شتانەی تۆ دەیلێیی؟ یانی مندالی بەگ و ئاغایان قڕانیان تێ كەوتووە، تا تۆ بكەنە مودیر و دكتۆر؟

بەدۆ – نا بابە نا، ئێستا ئەوها نییە. كێ بخوێنێ دەبێتە شت.

برۆ – كوڕە چۆن ئەوها دەبێ؟ گەر وابا، فەقیر و مسكین، لە بری ئەوەی مندالی خۆیان بكەنە شوان و گاوانی خەلكی، دەیاننادرنە بەر خوێندن، تا بیانكەنە بەڕێوەبەر و دادوەر. هەر بە ڕاستی بەدۆ، قوتابخانەی ئەوانەی پێیان دەلێن داواكاری گشتی لە كوێیە؟ ئەوان وەك ئاگرن وەللا. بیرمە ئەوێ سالێ گوندییەكانی ئێمەیان برد، منیش لەگەلیان بووم. داواكاری گشتی دەیگۆت لێیان بدەن، لێیان داین، دوایی گۆتی بیانگرن، ئێمەیان گرت، دواتر فەرمانی بەردانی دەركردین، وەللا ئێمەیان ئازاد كرد. كەسێكیش ئەو داواكارە گشتییەی نەبینیبوو. مرۆڤ گەر بەیەكێك بلێ شەقێك لە فلانەكەسی بدە، دەگیرێ و سالێك دەیخەنە زیندان. وەلێ داواكاری گشتی سالی سەت جار بە دادوەر دەلێ: فلانەكەس لە سێدارە بدەن، یان بیگرن، یان فلانەكەس مەگرن. وەللا ئەوە شتێكی زۆر باشە كوڕی خۆم، وەلێ كەینێ تۆ دەكەنە ئەو شتە؟

بەدۆ – بەلێ بابە، منیش دەتوانم ببمە داواكاری گشتی. هەموو مندالێك دەتوانێ ببێتە هەموو تشتێك. وەلێ لەبەر ئەوەی باوكەكان نەزان و هەژارن، مندالەكانیان ناخەنە بەر خوێندن و دەیانكەنە شوان و گاوان.

زینۆ – ئاخر برۆ گەر من نەبوومایە، تۆ ئەو منداڵەت دەخستە بەر خوێندن؟

برۆ – ئەوەی ڕاستی بێ، نەخێر!

زینۆ – ئێ باوکەکانی دیکەش وەك تۆن. ئێوە نازانن هەموو شتێك لە خوێندندایە؟ وەڵلا ڕۆژێك خانمی گەورە گوتی، باپیری بەگ، نازانم لە کامە گوندی ناوچەی لیجە هاتیتە دیاربەکر و خوێندوویەتی و بووەتە بەگ.

برۆ – ئێ دەبەسە دیسان خانمی گەورە خانمی گەورەت خستەوە سەر زاران. بەدۆ کوڕی خۆم دەزانی بەگ زۆر زانایە؟ بە بیرت نایێ پارەکە هاتبووە ئێرە و پێی گوتی "کوڕە تۆ بخوێنی دەبییە چی؟ تۆش وەك باوکت لێرە ئیش و کاری خۆت کردبا باشتر نەبوو؟".

بەدۆ – ئێ بابۆ بە دڵنیاییەوە ئەو هەر وەها دەڵێ. ئاخر ئەوە تۆ نزیکەی ٤٠ ساڵە ڕەنجبەریی بۆ دەکەی، دەیەوێ منیش ٤٠ ساڵ خزمەتی کوڕەکەی بکەم. چما ئەو نازانێ خوێندن و زانست لەوەی باشترە شوانی بۆ ئەو بکەم؟!

(لەو سەروبەندە، مام سەعدۆ و کەلۆس و سارۆخان دێنە میوانداریيان بۆ ئەوەی پێیان بڵێن چاوتان ڕوون کوڕەکەتان هاتۆتەوە. ئەوان لەسەر ئەو لبادەی دادەنیشن کە برۆی لەسەر دانیشتووە. ئەوجا دەست بە گفتوگۆ دەکەن)

زینۆ – برۆ هەڵستە میوان هاتن.

مام سەعدۆ- زینۆ کچی خۆم چاوت ڕۆن، ماشەڵڵا بەدۆش بووەتە پیاو. بەخێر بێیتەوە گەنجی قۆز. ئینشاڵڵا خوا وەك ناوی خۆت گەورەت دەکا.

بەدۆ – مامە گیان دەستەکانت ماچ دەکەم.

زینۆ – خوا لێت ڕازی بی جیران.

سەعدۆ – منداڵینە گوێ بگرن! هەر کێ چی بڵێ با بیڵێ، من هەردەم لەگەڵ خوێندن و مەکتەب بوویمە. لە سەردەمی یەکەمین جەنگی جیهان، ئەفسەرێکمان هەبوو خەڵکی سلێمانی بوو. ئەو ناوی مام خدر بوو، ڕەحمەتی بەردەوام دەیگوت "منداڵەکانتان بنێرنە قوتابخانە، چونکە ئەگەر بە ڕێی خوێندنێ دەرباز نەبن، بە خوا بە چ ڕێی دیکە لەو بارودۆخەی دەرباز نابن".

زینۆ – یاڕەبی جێی ئەو کابرایەی بەهەشت بێ. قسەکەی ڕاستە.

سەعدۆ – ئێ... گەنجی قۆز دە پێمان بڵێ تۆ لە خوێندن دەبیە چ؟

دوای خوێندنەوەی نامەکەت، کەحیا بەناو ئاواییدا ئاوای بڵاو کردۆتەوە: بەدۆی کوڕی بڕۆ، زیرەکترین قوتابیی مەکتەبی دیاربەکرە. (مام سەعدۆ بە پێکەنینەوە) بۆیە من و تۆ، با ئەمڕۆ یەکدی تاقی بکەینەوە.

سارۆخان – خوشکە زینۆ، کەحیا چاوی زۆر پیسە و کوڕەکەت بە چاو نەچێ باشە. بۆیە گەر بە قسەی من دەکەی، دوعایەکی چاووزاری لەبۆ بکە.

کەلـۆس – وەڵــلا ســارۆخان ڕاســت دەکـا. ئەوێ ســاڵێ، چێلێکمــان تــازە زابــوو، ڕۆژێکیــان دوای لەوەڕ بەنــاو ئاواییــدا گەڕابــۆوە بــۆ تەویــلە، لەوێ دەمێــدا کەحیــا ســەیرێکی کــرد و گوتی "کوڕە ئەوە مانگای کێیە؟ تۆ سەیری گــوانی بــکە چەنــد گەورەیە". ڕێك چوار ڕۆژ پــاش ئەو قســەیەی، چــێڵەکە گــوانی ڕەش بوو و شیری هیشکی کرد و گۆلکەکەشی مردار بۆوە.

بــرۆ – وەڵــلا ڕاســت دەکەی، کەحیــا هــیچ جارێــك نــاڵێ "ماشەڵلا".

زینۆ – دەك چاوم کوێر بێ، ئاخر من ئەوەم لە کوێ زانیبا؟! گەر وابێ، ئەوڕۆ لە ماڵەوە ڕەشکە بسووتێنم باشە، تا کــوڕەکەم بپارێزم، چونکە چاو و نەفەس ماڵوێرانکەرە.

سەعدۆ – هیچ نابێ نا، وازیش لەو بێعەقڵە بێنن. لە هەنــدێك شــوێن دەڵــێن، مانگــا هەیە ٢٠-٢٥ کیلــۆ شــیر دەدا، ئەی بــۆچی ئەوان بە چاو ناچن؟

یەڵــلا بەدۆ، کــوڕی خــۆم. ئەدی نەمــانگوت یەکــدی تــاقی دەکەینەوە؟ با پرسیار لە هەڤدوو بکەین.

بەدۆ – زۆر چاکە مامە گیان، یەڵلا لێم بپرسە.

سەعدۆ – نا نا کوڕی خۆم، گەر حەز دەکەی تۆ بپرسە؟

بەدۆ – نا نا مامە گیان تۆ بپرسە.

سەعدۆ – بەدۆ کوڕی خۆم، کیسەڵ بۆچی بووەتە کیسەڵ؟

بەدۆ – مامە گیان جا من ئەوە لە کوێ بزانم؟!

سەعدۆ – ئەی ئێوە نەتانخوێنــدووە؟ مــادەم ڕاوەســتە بــا مــن

پێت بڵێم. دەڵێن خاوەن گوندێکی زۆر دەوڵەمەند هەبووە. ئەو بەگە، کاتێك دەیزانی خەڵکی دەستکورت و بێ پارەنە، بە ڕبەی گەورە گەنمی بە نرخێکی هەرزان لە خەڵك دەکڕی؛ کاتێکیش نەبوونی ڕووی لە گوند دەکرد و گەنم نەدەما، بە ڕبەی بچووك و بە نرخێکی گران دەیفرۆشتەوە گوندییەکانی. جا ساڵەهای ساڵ بەگ ئەوە پیشەی بوو، تا خوا بەگی لە نێوان دوو ڕبەکەی عاسێ کرد و کردییە کیسەڵ.

بەدۆ – مامە گیان بە ڕاستی ئەوە هەقایەتێکی زۆر جوانە.

سەعدۆ – هەقایەتی چ کوڕی خۆم؟! ئەوە هەمووی ڕاستییە. چونکە ئەگەر لەبەر خاتری پێغەمبەری بەڕێزمان نەبووایە، ئەوەی ئەمڕۆ ئەو گرانییەیان دروست کردووە و فرتوفێڵ لە خەڵکی نەدار دەکەن، هەموویان دەبوونە ئاژەڵ؟ بە سەری تۆ ئەوسا لە تورکیا خەڵکێکی زۆر کەم دەماوە و زۆربەیان دەبوونە کەر و گا و ڕێوی و سەگ و کەو و کۆتر...

بەدۆ – وەڵڵا ڕاست دەکەی.

برۆ – کوڕی خۆم مام سەعدۆت زۆر بەهێزە و کەس دەرەقەتی نایەت.

زینێ – دەبڕۆ ئەتووش...

سەعدۆ - وەلێ ئێستا ئەوانەی دەچنە قوتابخانە، گوێ بەو ئاژەڵانەی دەوروبەری خۆیان نادەن. دەچن و نازانم چەند سەت مەتر لەژێر دەریا بەدوای شتی سەیروسەمەرەدا دەگەڕێن.

دەچن لە سەری چیاکانیش، بەدوای ماسیدا دەگەڕێن. ئەو ساڵەی لە جەنگ بووین لە چەنەقەڵا، ئێمە لەسەر چیایەك بووین

و ئەفسەرەکەمان دەیگوت، ئێرە شوێنپێی شەیتانۆکەی ژێر دەریای لێیە.

کەلۆس – ئەرێ مامە سەعدۆ، ئەوان ئەو چشتانە لە کوێ بزانن؟ ئەوان هەموو شت بە بەرەواژی دەخوێنن.

سەعدۆ – نا کوڕە نا، من هەر دەمەوێ سەر بخەمە سەر بەدۆ، ئاخر ئەو شتانەی ئەو دەیزانێ ئێمە لە کوێ بیزانین. جا قسەی بەدۆیە، زانست و زانین لەو چیرۆك و ئەفسانانەدایە.

سارۆخان – ناوەڵڵا مامۆ، تۆ خۆت پیشان دەدەی هیچ نازانی، لۆ تۆ وا دەزانی ئێمە نازانین تۆ بەقەد مەلایەك دەزانی؟

بەدۆ – وەڵڵا من نەمزانیبوو، تۆ ئەوەندە زانا و شارەزای.

سەعدۆ – کورە زانای چی و تەڕەماشی چی؟! بەلاش و حەلاش نەمانخوێند. هەموو ژیانمان لەناو ئەو هەژاری و گەندەومەندەییەی بەسەر برد، زوڵم و ستەمی ئاغا و بەگانیش لە لایەك بوەستێ. ئینجا گوێی خۆتانم بۆ شل کەن و با ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە کە چیم بەسەر هاتووە: لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید[1] و سوڵتان ڕەشاد[2]، منیان گرت و لەجیاتیی کوڕی برای بەگ، منیان ناردە سەربازی. جا بڵێ کوێ نەگەڕاین؟! چووینە سەلانیك و یەمەن و شام و بەغدا و حەلەب

---

(1) سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٤٢-١٩١٨) بە ٣٤مین سوڵتانی عوسمانلییەکان دادەندرێت. لە نێوان سالانی (١٨٧٦-١٩٠٨) سوڵتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی بووە. (وەرگێڕ).

(2) سوڵتان محەمەد ڕەشاد (١٨٤٤-١٩١٨)، ٣٥مین سوڵتانی عوسمانلییەکانە و لە مەودای سالانی (١٩٠٩-١٩١٨) سوڵتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی بووە. (وەرگێڕ).

و قەرس تاد... چ جێ نەما نەچینێ. لەو بێنەوبەردە و شەڕانە، چوار جاران بریندار بووم. زۆر برسییەتی و نەهامەتیم دیت. ئەوانەی لە ئێمە مردن و چوون، پێیان گوتن (شەهید) ئەوانەی بریندار و سەقەتوپەقەت بوون، پێیان گوتن (غازی)[1] ئەوانەی وەك منیش ساغ و سەلامەت مانەوە، بوونە کۆیلەی ئاغا و بەگی گوندان. ئەوە بووە ٧٥ ساڵ من لەو گوندەم. ئەوێ ڕۆژێ کەحیا زۆر لێم تووڕە بوو، بەو ڕیشە سپییەمەوە قسەی ئەوتۆی پێ گوتم هەر نەبێتەوە. ئەگەر لەبەر دایکی نەبا لە گوندی دەردەکردم.

برۆ – وەڵلا ڕاستە و کەحیا دەتوانێ گوندییان دەربکات. چونکە لە گوندییان عێدز بووە و بەگیش قسەی ناشکێنێ. ئەوێ ڕۆژێ بەگ بە ترومبێلی خۆی هاتبووە ئێرە و بە هەموومانی گۆت: "خەڵکینە باش گوێتان لە من بێ، کەحیا چی بکات کەیفی خۆیەتی و ئەوەی ئەو بیڵێ ئەو تەواوە".

زینۆ – خوا لێی هەڵنەگرێ.

سەعدۆ – دە بوەستە برۆ با بەدۆ قسەمان بۆ بکا. بۆ ئێوە نازانن بەگ هەر ئەوها دەڵێ؟! ما ئێوە قەت گوێتان لەوە بووە، ڕاوچی بە تاژییەکەی خۆی بڵێ کاتێك کەروێشکت بۆ ڕاو

---

[1] لە زمانی تورکیدا غازی، بەو سەربازانە دەگوترێت، بەشداریی جەنگێکی گەورەیان کردبێت و بە سەرکەوتوویی لێی دەرچووبن؛ یاخود سەربازێك لە بەرەکانی جەنگ بریندار دەبێ و دواتر جەنگەکە دەبەنەوە و ئەویش چاک دەبێتەوە. ڕیشەی وشەکە عەرەبییە و لە زمانی تورکیش بەکار دەهێندرێت. لە فەرهەنگی ئیسلامییشدا غازی هەر بەو کەسە دەگوترێ بەشداریی جەنگێکی کردبێت دژی دوژمنانی ئیسلام. (وەرگێڕ).

کردم، ئەزیەتی مەدە؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر، بەڵکوو ڕاوچی تەنیا تاژییەکەی فێر دەکا، نێچیرەکانی نەخوا.

بەدۆ — مامۆ پێم بڵێ لەبارەی چییەوە قسەت بۆ بکەم؟

سەعدۆ — بەدۆ کوڕی خۆم، لەو شتە تازانەی بەدیارکەتینە، سێ شتم ناچێتە ئەقڵی؛ یەکەم: دەڵێن مرۆڤ چوویتە سەر مانگ. ئەوەی دووەمیان: دەڵێن لێرەوە دەتوانن وڵاتی چین بۆردوومان بکەن. ئەوەی دیکەش: دەڵێن بۆمبێکیان دروست کردووە ناوی ئەتۆمە. وارێن خوا نەکا، دەتوانن بە یەکێك لەو بۆمبە ئەتۆمییانە، دیاربەکر خاپوور بکەن و لەگەڵ زەوی تەختی بکەن. من دەمەوێ تۆ ئەو شتانەمان بۆ ڕوون کەیەوە.

بەدۆ — کالۆ ڕۆژنامەکانمان باس لەوە دەکەن، ئەمریکا و ئینگلیز و ڕووسیا ئامێرێکیان ناردۆتە سەر مانگ. وەلێ هیچ مرۆڤێك نەچووە و نەهاتووەتەوە. جا جگە لەمانە، جەریدەکان باس لەوە دەکەن، ڕووسیا و ئەمریکا و ئینگلیز، ئامێرەکانی خۆیان تا لای مانگ دەنێرن و وێنەی دەگرن و دەگەڕێنەوە. ئێستاش ئەو وڵاتانە کار لەسەر ئەوە دەکەن، تا بچنە سەر مانگ و چەند ئەستێرەیەکی دیکەش.

برۆ — کورە هۆش لاوۆ، وەڵلا ئەو قسانەی تۆ لەناو ئاوایی بڵاو ببنەوە، دەڵێن یان شێت بووە، یان بووەتە گاور. کەحیاش لە گوندیمان دەردەکات. تۆبە تۆبە، چۆن دەتوانن بچنە سەر مانگ؟!

سەعدۆ — بۆ خاتری خوا برۆ تۆ وسکوت بە. عەقلی تۆ ئەو شتانە نابڕێ، جا کەحیا و گوندییەکانیش عەقڵتان بەدۆی نابڕێ ها؟ بەدۆ لاوۆ، تۆ پێیان بڵێ کوڕی خۆم، ئەو فەقیرانە

نەیانخوێندووە و دنیا نەگەڕاون، ئاخر لە کوێ بزانن؟! برۆ تۆ چوویە سەربازی و چەندت سەربازی کرد؟

برۆ – ئەرێ، هەژدە مانگان سەربازیم کرد.

سەعدۆ – (بەحەنەکپێکردنەوە) وەڵڵا گەلەك زۆرت کردییە و هەر خۆت کوشتییە. ئەی لە کوێ ماوەی سەربازییەکەت کرد؟

برۆ – لە سێرت.

سەعدۆ – ئەدی لە سەربازی چ بووی؟

برۆ – ئەدی ئەتوو چ بووی؟

(برۆ هەر خۆی وەللام دەداتەوە)

برۆ – من خەربەندە بووم.

سەعدۆ – کوڕی خۆم بەدۆ، ئەتوو سەربازییەکەی باوکت بینی؟ خەربەندە لە سێرتێ. یانی لە شوانییەتیی پەزان، چووە بوویتە مەیتەری ئەسپان. ئەی برۆ تۆ چۆن فێری تورکی بووی؟

برۆ – ئاپۆ فێربوونی چی و حاڵی چی. ئەو چەند ڕستە و وشەیەی دەشیزانم، هەندێکیان لە ئەفسەرەکەم فێر بووم و هەندێکی دیکەش، ئەو کاتەی دەستگیراندار بووم، لە بۆ زینۆی چوومە شار و لە ماڵی بەگ خزمەتکاریم دەکرد. لەو جێیانە تۆزە تورکییەکی فێر بووم. وەلێ هەموویم لە بیر کردییە. بەڵام ئەها ساڵێك پێش ئێستا لە ناحییە پاسەوانیم دەکرد، لەوێش هەندێك تورکی لە جەندرمان فێربووم.

سەعدۆ – باشە باشە برۆ، بۆ خاتری خوا بێدەنگ بە و با

گوێمان لەو زانیارییە ناوازانەت نەبێ. باشە ئەی کوڕی خۆم، ئەو تۆپانە چۆن دەگەنە ئەو دوورییە؟

بەدۆ — مامە ئەوانیش وەك ئەوانەن کە دەچنە سەر مانگ، وەلێ ئەوان ناچنە ئاسمان، بەڵکوو ڕاستە و ڕاست بەرەو ئامانجەکانیان دەچن.

سەعدۆ — منداڵینە خۆ دیتتان ئەو گەنجە چەند بە جوانی زانیارییەکانی خستە ناو مێشکمان؟!

سارۆ خان — (باوێشکێکی دێتێ) وەلێ بێ فایدە، کاتی نوێژکردن هات.

سەعدۆ — کاتی خۆی لە سەربازی ئەفسەرێکی دیاربەکریمان هەبوو دەیگوت "فێربوونی زانیاریی تازەش بە قەد نوێژکردن خێری هەیە".

کەلۆس — نا نا ئاپێ سەعدۆ، هێشتا نوێژ زۆری مایە.

سەعدۆ — هەر بە ڕاست؟ مادەم وایە بەدۆ بابی خۆم، هەندێك باسی ئەو بۆمبە ئەتۆمییەمان بۆ بکە. چونکە لە یەکەمین جەنگی جیهانی، بەهێزترین بۆمب، بۆمبی ئەڵمانی بوو. ئەو بۆمبە توانای هەبوو جێیەکی هێندەی ژوورە شوێنێك وێران بکات.

بەدۆ — مامە گیان ئەو بۆمبانە ڕاستن. وەلێ ئێمە نازانین ئەو بۆمبانە چۆن دروست دەکرێن. بەڵام لە دنیادا تەنیا ڕووس و ئینگلیز و ئەمریکی و فەڕەنسی دەزانن، بەڵام بەکەس ناڵێن چۆن دروست دەکرێ.

سەعدۆ — ئۆهۆ ئۆهۆ، جارێکی دیکەش ئینگلیزی تێدایە؛ بۆیە خێری تێدا نییە. چونکە ئەوان تەنیا بە دوای بەرژەوەندیی

خۆیان دەکەون. ئەدی هەر ئینگلیز نەبوو لە یەکەمین جەنگی جیهانی ماڵوێرانیان کردین؟ ئەدی بەدۆ کوڕی خۆم، تا ئێستا هیچ کام لەو وڵاتانە ئەو بۆمبەیان لەیەکدی گرتییە؟

بەدۆ – بەڵێ مامە گیان، لە دووەمین جەنگی جیهان، ئەمریکا ئەو بۆمبەی لە شارێکی ژاپۆنێ دا، ناوی "هێرۆشیما"یە، بە جارێك نزیکەی سەت و بیست هەزار کەس کوژران. لەگەڵ ئەوەی شارەکە لە دیاربەکریش گەورەتر بوو، بەڵام هەمووی سووتا.

زینۆ – وەییی، ئەوانە لە خوا ناترسێن! برۆ ئەوانە گاورن کاکۆ...؟!

سەعدۆ – ئەرێ بە خوای وەیە. ئەوێ ڕۆژێ لە قاوەخانەی عەباس لە دیاربەکر، هەندێ کەس باسی هەمان شتیان دەکرد، وەلێ کەس گوێی پێ نەدەدان. خەڵك دەترسان و وایان دەزانی پۆلیس و سیخوڕن و دەیانەوێ قسەمان لێ دەربهێنن. وەلێ ئەوان ڕاستییان دەگوت. ئێ بەدۆیە فەندی تۆ پێم بڵێ، ئەو تۆپانە، چۆن دەتوانن ئەوەندە دوور بڕۆن؟ داخوا ئەو تۆپانەش وەکوو فڕۆکە بە بەنزین دەڕۆن، یان وەکوو تۆپی دیکە، بە باروت و کەپسوولەی دەڕۆن؟

بەدۆ – مامۆ، ئێمە ئەوانەمان لە مەکتەب نەخوێندووە، لێ ئەوێ ڕۆژێ لە گۆڤارێك خوێندمەوە نووسرابوو: ئەو کڵاوە ئەتۆمییانە، وەك چەند فیشەکێك بەیەکەوە بەستراونەتەوە. سەرەتا یەکێك لەو بۆمبانە دەتەقێت و تۆپەکە دەهاوێت، کاتێك سووتانی ئەو تەواو دەبێت، دانەیەکی دیکە دەتەقێنێت. بەو شێوەیە تا دەگاتە شوێنی مەبەست و لە ئامانجەکەی دەدا.

سەعدۆ – یاخوا هەر هەبێ کوڕۆ. بە خوای هەر دەبێ ئەوهابێ!

کەلۆس – بابۆ من لە سەربازی شتی وەهام نەبیستبوو.

سەعدۆ – کوڕی خۆم تۆ ئەوانە لە کوێ دەبیستی. ئاخر ئێمە هەموو عەقڵ و هۆشی خۆمان بۆ فەسادی حیزبایەتی بەگەر خستووە. ئاخر مەسەلەی حیزبی گەل و دیموکرات بە ئێمە چی؟! ٣٠ ساڵە هەر باسی ئەوە دەکەین، ئێمە ئەوەین و ئاغا و بەگەکانیش فلانە شتن. کەچی ئەوە ٩ ساڵ ١٠ ساڵە، ئێمە هەر ئەوەین و بەگەکانیش بوونە دیموکرات. بۆ ئێمەی هەژار هەمووی وەك یەکە. ئەو حیزبانە، حیزبی ئاغا و بەگانن.

برۆ – کوا هەمووی وەك یەکە، من لایەنگیری پارتی گەلم.

سارۆخان – ناوەڵلا برۆ، دیموکراتەکان لەو پارتەی تۆ دەیلێی باشترن.

سەعدۆ – هەش بەسەرتان، ئێستا ئێوە دەزانن کاتێك ئاوا قسە دەکەن، چەند ئەحمەق دەردەکەون؟!

خوالێخۆشبووی باوکم چیرۆکێکی دەگێڕایەوە، هەرگیز لە بیرم ناچێ. ڕەحمەتی دەیگوت: لە ساڵی نەهاتەکەی، کاروانێکی فەقیران دەچووە دەشتێ، بۆ ئەوەی هەندێك زاد بۆ منداڵەکانیان پەیدا بکەن. وەلێ لە ڕێگا دەستەیەك ئەشقیا لێیان پەیدا دەبن و دەست و پێیان دەبەستنەوە و چشیان پێ بووە لێیان دەستێنن. دواتر هەر لەبەر چاوی ئەوان تالانییەکان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. وەلێ چەندی دەکەن ڕێك ناکەون، بۆیە خەنجەر لە یەك هەڵدەکێشن و بەناو یەك دەکەون و چەند

کەسی لەیەك دەکوژن و چەندی دیکەش بریندار دەبن. جا لەبری ئەوەی دەستبەسەرکراوەکان کەیفیان بەو پێشهاتە بێ، کەچی زگیان بە ئەشقیایەکان سووتاوە و لە دوورڕا هاوار دەکەن و لێیان دەپاڕێنەوە دەست لە یەك بەردەن. جا منداڵینە، ڕێك حاڵی ئێمەش وەك حاڵی ڕێبوارانی ئەو کاروانەیە. ئەو حیزبانە ئەوهان، تا لە دەستیان بێ غەدر و زوڵم لەو خەڵکە بەستەزمانە دەکەن، کاتێکیش شەڕیان لە بەینێ دروست دەبێ، ئەو خەڵکە داماوە دەڵێن ئەوە باشە و ئەوە خراپە.

کەلۆس – ئەرێ خەڵکینە، لەناو گاوڕانیش ئەو حیزبومیزبانە هەیە؟

بەدۆ – ئەدی کوو نییە، ئەی وا نییە مامە سەعدۆ؟

سەعدۆ – ڕاستە کوڕی خۆم، ئەوانیش حیزبیان هەیە، وەلێ دەڵێن وەکوو ئەوانەی ئێمە نینە.

بەدۆ – ئاخر ئەو حیزبانەی ئەوان چۆن وەك ئەوانەی ئێمە بن؟ ئەوان، شێخ و ئاغا و بەگیان نییە. وەلێ لێرە پارتی هی ئەو توێژانەیە. ئێمەش لە ترسی ئەوان، دەنگ بەو کەسانە دەدەین کە ئەوان دەیانەوێت. بۆیە نوێنەرانی دەرچوو و سەرکردایەتیی حیزبەکانیش بە ویست و خواستی ئەوان کار دەکەن.

سەعدۆ – دە هەستن کوڕینە، وەڵڵا ئەوە ئێوارە داهات. ئێستا ماڵات دەگەڕێنەوە ئاوایی. هەرچەندە حەزیشم لێ نییە لە بەدۆی کوڕیشمان دابڕێم.

بەدۆ – وەڵڵا دڵ ئاوێنەی دڵە، منیش ئەتۆم زۆر بە دڵە مامۆ. بریا ئەوڕۆ ئێوارە بەیەکەوە شیومان بخواردبا.

زینۆ – هەر بە ڕاست، مامە سەعدۆ تۆ بۆ ئەو ئێوارەیە لای ئێمە، لەگەڵ بەدۆ نامینێیەوە؟

سەعدۆ – وەڵڵا عادەتم نییە، کوڕی تۆش ساغ بیێ، هەر کاتێك دەرفەت هەبوو، دێم و سەرێکتان لێ دەدەم.

(میوان هەڵدەستن و خاوەن ماڵیش بۆ بەڕێکردنیان تا بەر دەرگا لەگەڵیان دەچن)

زینۆ – بەخێر بێن سەر سەر و سەرچاوان، ماڵ ماڵی خۆتانە و کەینێ ویستتان بەخێر بێن.

بەدۆ – مامۆ سبەینێ دیسان وەرەوە، ئەوجا نۆرەی منە شتت لێ بپرسم.

سەعدۆ – بە دیتنت خۆشحاڵ بووم. وەلێ خۆ من ئەوەندە نەزان نیم، تا لەگەڵ تۆ بکەومە ناو شەرت و مەرجان. هەموو زانست و مەعریفەی ئێمە، لە چەند پەندێکی پێشینان و چەند هەقایەتێکی فۆلکلۆری تێناپەڕی و لەوێڕا هاتییە.

بەدۆ – ناوەڵڵا مامۆ، بە ڕاستی پرسیار و ئاخافتنەکانت زۆر خۆش بوون.

سەعدۆ – لە ڕێز و ئیحتیرامی خۆتە کوڕی خۆم. ئاخر کەسی خوێندەوار، حەنەك بە گەورەی خۆی ناکا. لەبەر ئەوە نزیکەی ٤٠ ساڵە، زمانم شل بوو هەندی بەو گوندییانەی خۆمان بڵێم: نە بخۆن و نە بخۆنەوە، بڕۆن و لە قوژبنێکی شاری دانیشن

و حەمباڵی بکەن، وەلێ منداڵەکانتان بنێرنە بەر خوێندن.

کوڕم خۆت دەزانی سمکۆ لە تەمەنی تۆیە، دە ساڵی ڕێك هەوڵم لەگەڵ باوکی دا، وەلێ کردییە عینادی و نەینارده بەر خوێندن. هورمزیش بە گوێی منی نەکرد، ساڵی چووی لە ماڵی بەگ لە گوندی کەنار ڕووباری دیجلە شەڕێك دروست بوو، لەوێ بە چەك لە یەکێکیان دابوو؛ وەلێ تاوانەکەیان لە ملی سمکۆی ڕاکرد. خوا لە دادوەر خۆش بێت، لەبەر ئەوەی تەمەنی بچووکە سزاکەی کەم کردەوە و کردییە ١٠ ساڵ. ئێستا بە ناگزووری و سەفیلی لە زینددانی دیاربەکرێ کەتییە. دەڵێن ئەسپێ خەریکە چاوی دەرینی. ئەو بەلەنگازە لەبەر بەگ دەستگیر کرا. کەچی بەگ ڕۆژێکیش لە زیندان نەچووەتە لای و فلسێکیشی نەداوەتێ. ئێ باوکیشی نەدارە و خزمەتکاری خەڵکە. جەرگم کزەی لێوە دێ لۆ ئەو کوڕەی، چونکە ئەو کوڕە دوور نییە لە زیندان بمرێت. ئەگەر بیخوێندبا و چووبا مەکتەب، بۆچی ئەو کارەساتەی بەسەر دەهات؟ دەبوو ئێستا ئەویش، وەك تۆ لەناو ئێمەدابا و وەك تۆ ڕێگای ڕاستی پیشان دابایەن. کوڕی خۆم وەك دەبینی، ئێمە هەر هەموومان لێرە، لەبەر نەزانی و بێ ماریفەتی وەك کۆرەمان لێ هاتووە و هەموو شت تێکەڵوپێکەڵ دەکەین. هەرچی دێت چەپەرۆکێکمان لێ دەدا. کوڕی خۆم، تەنیا کەسانی وەك ئێوە، دەتوانن ئێمە ڕزگار بکەن. گەر هاتوو تۆ کوڕی زینۆ نەبای و کوڕی بەگ بای، ئاخۆ ئێمە ئێستا ئەوها دەمانتوانی لە دەورت کۆ ببینەوە و ئاوا قسان بکەین؟ جا بەر لە هەر شتێك بێ، سوودت بۆ ماڵبات و خزم و کەس و خەڵکی خۆت دەبێ. ئەی نالێن هەر تەیرەك بە ڕەوی خۆی.

کەلۆس – مامە سەعدۆ یانی چۆن؟

سەعدۆ – هەر وایە کوڕی خۆم. ئەی ئاژەڵیش وەها نییە؟ گەر هات و ئەمڕۆ بزنێك و ئەسپێکی غەریب بێنە ناو ئاوایی، بزنەکە ناچێتە ناو مێگەل و ناو بزنان و ئەسپەکەش ناچێتە ئاخوڕی ئەسپان؟ مرۆڤیش ڕێك ئەوهایە! گەر منداڵی گوندیيان نەبن، کەی منداڵە خوێندەواری بەگان دێنە لای ئێمە و لەگەل ئێمە دادەنیشن؟ ئەوان تەنیا کاتی هەڵبژاردن، ئەویش بە بێز و قێزەوە دێنە ئێرە و داوای دەنگمان لێ دەکەن و بەس. ئەگەرنا چ کاريان بە ئاواييە؟!

دە یەڵڵە ئەوە من ڕۆیشتم و لەسەر خاتری ئێوە. کاکە دەردمان گەلێك گرانە، نابی بە سەر زاریشماندا بێ. ئاخر زۆر جاران لەسەر ئەو زمانەی تووشی بەڵای خۆمان بووینە. زگمان پڕی قسەیە و سەری زمانیشمان بڤەیە.

(خانەخوێیەکان لەگەل ڕۆیشتنی میوانەکانیان دەڵێن)

زینۆ – جیرانینە، بەخێر هاتن سەر سەر و سەر چاومان.

برۆ – خێر و خۆشیتان لەگەل خۆتان هێنا.

بەدۆ – مامە دووبارە وەرەوە و چاوەڕێتم.

شوێن: دیسان ماڵی برۆیە. ئەو ڕۆژی برۆ نەچووەتە جووت و لە ماڵ مایتەوە. زینۆش لە بەردەم سێلەکە دانیشتووە و مژوولی نانکردنێیە. برۆ و بەدۆش تۆزێك لەولاتر، لەناو دەفرێکی دار، بە کەوچکێکی دارین، دۆ دەخۆنەوە و زینۆش لەبەرڕا، ئەستوورکیان دەداتێ.

زینۆ – کوڕی خۆم ئەمشەو لەسەربان بە ڕاحەتی خەوتی؟

بەدۆ – بەڵێ دایە گیان، من زۆر حەزم لە خەوی سەرخانییە.

برۆ – کچێ تۆ نازانی سەرخانیی ئێمە، زۆر لە ژوورە تاریك و تەسکەکانی شاری خۆشترە.

زینۆ – دە تۆش بڕۆ تخوا! ئاخر تۆ چوزانی خۆشترە یان نا؟! گەر بە تۆ بێت ئێمە هەر لەناو...

بەدۆ – یادێ قوربان، تخوا واز لە بابم بێنە و عێدزی مەکە.

زینۆ – کوڕی خۆم، دەبینی! ئەوڕۆ نەچووە جۆتەکەش.

برۆ – زینۆ، بەسەری شێخی، ئەوڕۆ هەم زۆر ماندی بووم، هەمیش دەستم لە بەدۆی بەر نەدەبوو. ماڵخرا، ئەوە پێنج شەش مانگە، قەت ڕۆژێك لە ماڵ بوویمە؟ کوڕی خۆم خۆ دەبینی، دایکیشت نانێکی لەگەڵ ماڵی بەگ خواردییە و ویژدانی مرۆڤایەتیی تێدا نەمایە.

زینۆ – ئاخر کوڕی خۆم دە لە بابت بنۆڕە، ئەوە ۳۰ ساڵە هاتوومەتە لای، کەچی هەر جارێك ئەو بابەتە دەکرێتەوە، تێکەڵی ماڵی بەگم دەکاتەوە. تۆ سەیرێکی بکە و ویژدانی ببینە. ئینجا لۆ خۆت لێکی بدەوە، فەقیرێکی وەکوو من لە کوێ و ماڵی بەگ لە کوێ.

(برۆ سمێڵی خۆی، لەو دۆیە دەسڕێتەوە کە پێیەوە نووسابوو. ئینجا بەدۆ ماچ دەکات)

برۆ – کوڕم کەس ناتوانێ گاڵتەیەکیش لەگەڵ دایکت بکا. لەگەڵ هاتنەوەی تۆ، زینۆی دایکت بە جارێ هار بووە.

زینۆ – بۆ برۆ من چیم کردووە؟ ئێستا ئەو کوڕە ماچ دەکەی، بەڵام هەر تۆ نەبووی دەتگوت با نەخوێنێ؟

برۆ – دە بەسە ئەتووش بێعەقڵ. کچێ ئاخر جگە لە تۆ و ئەو کوڕە من چیم هەیە؟ ئاخر پێم ناڵێی کێی دیکەم هەیە شێتوشوور؟

بەدۆ – یادۆ وەڵلا من زۆر بیری بابمم کردبوو. ڕۆژێك لە شار یەکێکم دیت، گۆتم دەبی ئەوە بابم نەبی؟! تا دەرگای مێردینێ[1] بەدوای کەوتم. بەڵام کە لێی نزیك بوومەوە، دیتم ئەو نییە. ئەوێ ڕۆژێ بە دڵساردی گەڕامەوە و زۆر بێتاقەت بووم.

زینۆ – ئەی من؟ یانی هیچ غەریبیی منت نەدەکرد؟

بەدۆ – چۆن دایە گیان، زۆر زیاتر غەریبیی تۆم دەکرد.

برۆ – وای وای، یانی (زۆر زیاتر) غەریبیی دایکت کردییە

---

[1] شوورای دیاربەکر جگە لەوەی دوای دیواری چین، بە گەورەترین و بەهێزترین شوورای بەرگری دادەنرێت لە جیهان؛ بە هۆی گەورەییەکەیشییەوە چوار دەرگای بە ناوی (دەرگای چیا، دەرگای ڕووها، دەرگای تازە، دەرگای مێردین) هەبووە. (وەرگێڕ).

ها بەدۆ...؟! باشە لاوی خۆم، باشە هەر بۆ شۆخیم بوو. بەلام بێ لە سوحبەت، دایکت هەقی زۆر بەسەرمانەوە هەیە. ئەو ڕەبەنە زۆرمان پێوە ماندوو بووە.

(بەدۆ مەلاك و نانەکەی دەستی دادەنێ و دەوی خۆی بە پارچە دەستماڵێك خاوێن دەکاتەوە).

بەدۆ – دایە گیان وەللا من تێرم خوارد.

زینۆ – وای لە هۆشی من کوڕی خۆم! لەبیرم کرد هێلکەت بۆ بێنم. دە بوەستە با بیهێنم.

بەدۆ – نا بە خوای دایە گیان، من تێرم خوارد.

زینۆ – دەوجە وەرە، ئێ دە ڕاوەستە ئاخر کەینێ تۆم برسی کردووە؟

برۆ – وای وای وای... بابی خۆم ئەوڕۆ زینۆ زۆر مەردانەیە.

زینۆ – دەوجە وەرە، ئەرێ برۆ من کەی تۆم بە برسییەتی هێشتۆتەوە؟

برۆ – کچێ حەنەکم لەگەڵ کردی؛ وەللا منیش تێرم خوارد.

(برۆ نان و دۆیەکەی پێشی بەلاوە دەنێ)

بەدۆ – یابۆ نۆشی گیانت بێ.

برۆ – بەرخوردار بی کوڕی خۆم.

زینۆ – بابی تۆ وەهایە کوڕی خۆم، نازانیّ زیادخواردن چییە. وەك فەقیران تۆزێك دەخوا و تەواو.

برۆ – من دەڵێم ڕەنگە گەدەم بچووك بووبێتەوە زینۆ.

زینۆ – بە دڵنیاییەوە برۆ، ئاخر ڕۆژێك بووە تۆ پڕ بە دڵ وەك ئەو خەڵکە نانت خواردبیّ؟! ئەو ساڵەی چوومە شار، زۆر عەجایبم بە قەڵەوی و تەنگەئەستووریی خەڵکی شار هات. ژن و پیاویان لە قەڵەوییان بە دەرگاوە نەدەچوون. هورگیان وەك کەواری بوو.

بەدۆ – بەڵام یادیّ ئەو قەڵەوییەی تۆ باسی دەکەی، شتێکی باش نییە. بۆیە هیچ یەکێك لەوانەی شاری، ناتوانن لەگەڵ باوکم ١٠٠ شەقاوان باوێن.

زینۆ – چی چی، کوڕی خۆم بە خوا باوکت هیچی پیّ نەماوە.

(برۆ بە پێکەنین و لەخۆباییبوونەوە)

برۆ – ئەوە لەگەڵ منتدایە زینۆ؟ ماڵت خەرانەبیّ، من هێشتا لەسەر شنگ و تاقەتی خۆمم! جا خەڵکی شار چین؟ ڕاستە ورگ گەورەن، بەڵام هیچیان بەسەر هیچەوە نییە و هەر تەنگەیان گەورەیە و بەس.

(وەختەکەی بووەتە چێشتان. لەبەر ئەوەی کوڕەکەیان قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردییە و گەڕاوەتەوە گوندی، سەعدۆ و دراوسێکانیان دیسان دێنەوە سەردانیان).

بەدۆ – دایە سەیرکە کێ هات؟

برۆ – زینۆ ڕایەخەکی ڕابێخە. دە دەستێکت بێرەدا هێنابا.

زینۆ – دەمێ دی گێسکەکم پێدا هینا برۆ، خاوێنە.

سەعدۆ – سەلام و عەلەیکوم

برۆ – وەعەلەیکومەسەلام. مام سەعدۆ کەرەم کەن و لەسەر ڕایەخەکە ڕوونیشن. جیران ئێوەش وەرنە سەر ڕایەخەکە.

زینۆ – بەخێر بێن سەر سەر و سەر چاوان. گەر ژوورەوەیان پڕ دووکەڵی نەکردبێ، ئەوا ئەو سێر و فەرشەیەش خەریکە کاریان تەواو دەبێ.

سەعدۆ – لەبەر ئێمە هەڵیمەگرەوە و تۆ خەریکی کاری خۆت بە کچی خۆم. وەلێ تۆ بۆ نانی بە تەندووری ناکەی؟

زینۆ – ئاپۆ وەڵلا کوڕەکەم غەریبیی نانی سەر سێلێی کردییە. وەکوو دیکەش وەکی دیتت، لەبەر ئەوەی ئاردی گەنم بوو، بۆیە شەرمم کرد بیبەمە سەر تەندووران. چونکە لەوەی ترسام منداڵ ببینن و نەفسیان بچێتێ.

(زینۆ سێلەکە هەڵناگرێتەوە و چەند نانی دوایش دەکا و لە لایەکی دیکەش کەم کەم لەگەڵ میوانان مژوول دەبێ هەتا چەند ئەستوورکێکی گەرم بداتە میوانەکانی)

زینۆ – دەمەوێ سەر و پارچە نانەکی گەرم بخۆن.

سـەعدۆ - هەر هەبـی بـابی خـۆم. بە سـەری بەدۆی نـانم خواردییە ئەوجا هاتیمە.

کەلۆس – بە ناوی خوای ئەگەر ناسکەنانی بەشەکریش بی، هەر پێم ناخورێ.

سەرۆخان – ئاخر ئەگەر پێم خورابا، خۆ شەرمم نەدەکرد.

(زینـۆ نانەکـانی تەواو دەکـا و لەسـەر سـینییەکیان دادەنـێ و سەریان دادەپۆشێ. ئینجا سێل و فەرشەی خۆی هەڵدەگرێتەوە و ئاگرەکەش دەکوژێنێتەوە. بەدۆش زۆر دڵخۆش و بە کەیفە)

بەدۆ – بە خوا زۆر باش بوو دیسان هاتنەوە مامە گیان.

سەعدۆ – ئێمە هەر دێین گەنجۆ. ئێمە ئەگەر نێیـنە لای تـۆ، ئەی بچینە لای کێ؟ گوندیی فەقیر و هەشبەسەر، هێشتا قەدری تـۆ نـازانن. چـونکە ئەگەر بەهـای تۆیـان زانیبـا، دەبـوو ئەورۆ، داوەتێکیـان بە دەهـۆڵ و زورنـاوە سـاز کردبـا. وەلـێ ئەوان چ بزانن، لە کاتێکدا هۆشـیان لە سـەریدا نەمـایە. ئـاخر ئەوان وەك گەڵایەکی وشکی بەر ڕەشەبایان لێ هاتووە.

ڕەشۆ – ئێ چ بکەین مامە سەعدۆ؟ماڵی فەقیری ئاوا نەبـێ، ئەی تۆ نەتدەگوت "فەقیری ژەنگی پیاوەتییە؟".

سـەعدۆ – بەدۆ کـوڕی خـۆم، لە خۆشـیی هـاتنەوەی تـۆ، دەستمان لە کارێش سـارد بـووە. ئەورۆ چەنـد ئیشیشـم هەبـوو،

وەلێ نەچووم بیانکەم.

زینۆ – وەڵڵا شتێکی زۆر قنجت کرد مامە سەعدۆ. لە ئێوارەوە بەدۆ هەر باسی تۆ دەکا.

سەعدۆ – بەدۆ، تۆ دەبێ پێنج فەرزە نزا بۆ زینۆ بکەی، چونکە من دەزانم ئەوە یازدە ساڵە چ دەرد و کەسەر و هەژارییەکی بەسەر برد، وەلێ ماشەڵڵا ئەوە بووە دایکی ئەفەندییەکی وەك شێران.

(سەعدۆ ڕووی خۆی لە گوندییەکانی تەك خۆی دەکا، کە لەگەڵی هاتبوون)

سەعدۆ – کوڕینە ئەو ئەفەندییەی ئێمە، وەك ئەفەندیی بەگ و ئاغایان نییە. چونکە ئەوە ئەفەندیی هەوڵ و ماندووبوونی برۆ و زینۆیە.

زینۆ – خودای گەورە ئەفەندیی هەموو کەسێك بهێڵێ. مامە گیان خۆ تۆ بینیت، من حەفت منداڵم خستە ژێر گڵی و تەنیا ئەوەم بۆ ماوەتەوە.

سەعدۆ – کچی خۆم، ئینشاڵڵا خوا ئەو کوڕەت بۆ ئێمە و ئێوە و تەواوی خەڵکی دەهێڵێ. جا تۆ دەزانی، ئیدی کوڕی تۆ بە تەنیا هی تۆ نییە، بەڵکوو هی هەموومانە. هی هەموو نیشتمانەکەمانە. ئیدی بە قودرەتی خودای ئەوڕۆ بەدۆی کوڕی ئەو نیشتمانەیە، سبەی دەبێتە باوکی ئەو نیشتمانە ئینشاڵڵا.

ڕەشۆ – وەڵڵا ڕاستە ئاپۆ، ئەوساڵ شەشەم یان حەفتەم ساڵمە لە شاری بوڕسا سەربازم. گوندەك هەبوو لەوێ ناوی (عومەر

بەگ)[1] بوو. وەلێ گوند چ گوند، زۆر لە شارێك خۆشتر. مـن هـۆی خۆشـیی ئەو گونـدەم لە خەڵـكەكەی پرسـی، ئەوانـیش گوتیـان یەكێكـی ئەو لادێـیە بـووەتە پیـاوێكی گەورە و ئەو گوندەی خۆی ئەوها خۆش كردووە.

سەعدۆ – نا نا ڕەشۆ من وا ناڵێم، چونكە ئەوانەی تۆ باسیان دەكەی، مەردایەتییەكەیان لەسەر باخەڵی خەڵكییە، بەڵام ئەوەی ئێمە بە كار و خەباتی خۆی ئێمە ڕزگار دەكا. تەنیا بۆ گونـدی خۆشی سوودمەند نابێ. منیش وەك تۆ، لە سەربازی زۆرم دیت، كە پارەی خەڵكیان دەدزی و خزمەتی خەڵك و گوندی خۆیان پێ دەكرد. بەڵام گەنجی ئێستا زۆر باشترن ڕەشۆ. ماوەیەك بەری نها چوومە دیاربەكر. بینیم شـار بەسـەر دوو بەرە دابەش بـووە، یەكێكیـان گەنـج و لاو و خـۆرت، ئەوەی دیـكەش پیـر و ئیختیارەكان. جا ئەو ئیختیار و پیرە چەپەڵانە، بەو گەنجانە دەڵێن كۆمۆنیست.

كەلۆس – ئاپۆ كۆمۆنیست چییە؟

سەعدۆ – كوڕی خۆم جا من چـوزانم چیـیە! وەلـێ دەزانـم كێ لە كێ تووڕە بێ، پێی دەڵێ كۆمۆنیست.

ڕەشـۆ – پێیـان دەڵـێن حیـزب، بەس پـێم وابـێ بە چ شـتان ناچن.

[1] گوندەكە لە ڕاستیدا لادێی جەلال بەیاری سەرۆكی پێشووی توركیایە.
جەلال بەیار (١٨٨٣-١٩٨٦). لە نێوان ساڵانی (١٩٣٧-١٩٣٩) لە سەردەمی سەرۆككۆمار مستەفا كەمال ئەتاتورك سەرۆكوەزیرانی توركیا بووە. لە نێوان ساڵانی (١٩٤٦-١٩٥٠) سەرۆكی پارتی دیموكرات بووە. لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) سێیەمین سەرۆككۆماری توركیا بووە. (وەرگێڕ).

سەعدۆ — نا نا کوڕینە، من شتێکم پـێ نەگـوتن. ئەو ڕۆژە چوومە شار، لە مەیـدانی شـارەوانی، جەهەپە[1] دیـداری هەبـوو. هەر گەنجێکی دەچووە سەر سـەکۆی، وەك کەو دەیخوێنـد. بە شـێوەیەك، هەرچـی دزی و گەنـدەڵی و بەرتیلـی پیرەمێردەکـان هەبوو، هەموویان بە گۆڕێ وەرکرد و ئەوەی بـن بەڕێیـان هێنـا سەر بەڕێ.

برۆ — چ چ سەعدۆ؟ چییان دەگۆت؟

سەعدۆ — برۆ وەڵـڵا تـۆ تێـی نـاگەی! ئـاخر ئەوان چ بڵـێن. دەیـانگوت ئەو سیاسـەتمەدارانەی پێشـوو، خەڵکیـان نەخـۆش گەرەك بووە، بەڵام تەنیا قازانجی خۆیـان لا مەبەسـتە. وەلـێ ئەو ئیختیارانە نەیاندەزانی ناتوانن بەسـەر هۆشـمەندیی نەوەی تـازەدا باز بدەن. بۆیە پێویستە ئیدی دەست لە کاروباری وڵات هەڵگرن و ئەرك و بەرپرسیارەتییەکان بە گەنجەکان بسپێرن.

بەدۆ — وەڵڵا ڕاستە مامە گیان. لە مەکتەبیش گەلێك هەڤـاڵی شاری و منـداڵی بەگانمـان لەگەڵە، ئەوانـیش لە بـابی خۆیـان بە گلەیین. یانی ئەوانـیش زۆر زگیـان بە گونـدییان و خەباتکـاران دەسووتێ.

سەعدۆ — ئێ بە دڵنیاییەوە ئەوان زگیـان بە ئـێمە دەسـووتێ. ئەگەر بێ و ئەو گەنجانە بزانن، ئەو خواردنەی ئەوان لە مـاڵەوە دەیخۆن، بە چ ڕەنج و ماندووبوونێکی ئـێمە دەچێـتە بەردەمیـان باوەڕ نـاکەم لوقمەنانێکیـان بە قوڕگیـدا بچێتە خـوارێ. ماشـەڵڵا

---

[1] CHP پارتی گەلی کۆماری، یەکەمین پارتی کۆماری تورکیایە، ساڵی ١٩٢٣ مستەفا کەمال ئەتاتورك دایمەزراند. (وەرگێڕ).

گەنجی ئێستا هەموو وەك فریشتەن. دە بڵێ کوڕی خۆم، لەسەر خێران تۆ دەتەوێ ببیە چ؟

بەدۆ – مامە گیان، من قۆناغی ئامادەییم بە نمرەیەکی باش تەواو کرد، ئیدی لەوە بەدواوە بابم دەزانێ.

سەعدۆ – نا نا کوڕی خۆم، باوکی فەقیرت چوزانێ. هێشتا دایکت باشترە، وەلێ تۆ لە هەموومان باشتر دەزانی.

بەدۆ – گەر بە من بێت، یان دەمەوێ ببمە دختۆر، یانیش ئەندازیار.

برۆ – چ چ؟ تۆ گوتت ئەندازیار؟ بە خوا من قبووڵ ناکەم. ئاخر ئەو کڵاوگەورانە، سوودی چییان هەیە؟ نە دەتوانن لە کەسێك بدەن، نە کەسێکیش هیچیان دەداتێ.

سەعدۆ – دەوجە وەرن و سەیری عەقڵی برۆی بکەن. ئاخر هیچ شتێکی دیکە هەیە لەو دوو پیشەیە باشتر؟ خۆ بە لێدان و بەرتیل وەرگرتن نییە برۆ. ئاخر هەی بێمێشك، خەمی دختۆر و ئەندازیاران کەی لێدان و بەرتیل وەرگرتنە؟

زینۆ – وەڵڵا مامە سەعدۆ من هەر لە سەرەتاوە حەزم لێ بووە ببێتە دختۆر. لەبەر ئەوەی هەژار و نەدار، بەردەوام نزایان بۆ دەکەن. هەموو خەڵکێك دڵی لای ئەوانە. ئاپۆ ئەی تۆ بە بیرت نایەت، ئەو دختۆرە قنجەی تۆ لە دیاربەکر...

سەعدۆ – چۆن بیرم نایەت، مرۆڤ کەسی چاك چۆن لە بیر دەکات؟

برۆ – وەڵڵا هێشتا دختۆر لە ئەندازیاران باشترن. ئەو ساڵە بەشەڕ هاتین، پێش ئەوەی ئێمە ببەنە لای دختۆر، ئێمەیان بردە

لای عەریف. جا ئەو دووە چییان گوت، ئەوانی دیکە هەموویان گوێیان لەوان ڕاگرت.

سەعدۆ — هەتیو برۆ تۆ خۆشت نازانی چ دەڵێی. ئاخر تووخوا ئێوە سەیرتان بە برۆی نایەت؟

زینۆ — باوەڕ بکە مامە سەعدۆ، ئەو زەلامە بەردەوام هەر ئاوایە. ئاخر لە خەفەتی وی ڕۆژێک یەخەی خۆم دەدڕم و سەری خۆم هەڵدەگرم و دەڕۆم.

سەعدۆ — نا نا کچی خۆم، بە ڕاستی برۆ خراپ نییە، وەلێ ئەو فەقیرە چ بکا. ئەوساڵ دەبێتە چل ساڵ کە دەیناسم. ئەو جگە لەوەی لە دوای گایەکانی بێت و بچێت، چی دیکە نازانێ. دیسان باشە لە سایەی تۆ شتێک فێر بووە.

زینۆ — ئەدی ئەمن چ بکەم؟

ڕەشۆ — نا نا خوشکی خۆم ئەوها نییە. خۆ ئێمە هەموومان نەزان نین.

سەعدۆ — بەدۆ کوڕی خۆم، گەرتۆ ببیە ئەندازیار، دەبییە چ ئەندازیارێك؟

برۆ — ئەی ئەندازیار هەموو یەك نین؟ ئەوانەی جادان دروست دەکەن؟

بەدۆ — نا بابە گیان نا، زۆر جۆرە ئەندازیاری هەیە. هەندێك هەنە ڕێگا دروست دەکەن، هەندێکیش باڵەخانە و خانوو. هەیە ئەندازیاری ئاوە و هەیشە هیی نەفتە و هەشە ئەندازیاری کارەبایە.

سەعدۆ – ئەو کاتەی لە ئیستانبوڵ سەربازیم دەکرد، لەوێ ئەندازیاری کەشتییش هەبوو.

کەلۆس – ئاخر مامە گیان ئێمە چی لە ئەندازیاری کەشتیان بکەین؟ ئاخر با بیێتە ئەندازیارێك بە کەڵکی ئیشی ئێمەش بێت. ئاخر ئێمە کەشتیمان لە کوێ بوو؟

سەعدۆ – کوڕی خۆم، نیەتی کۆتایی تۆ چییە؟

بەدۆ – مامە گیان بە ڕاستی، من زۆر حەزم لە ئەندازیارییە.

برۆ – کوڕە تۆ گاڵتە دەکەی؟!

بەدۆ – ناوەڵلا گاڵتەی چی؟

سەعدۆ – کوڕە برۆ، شتەك هەیە وەك ئەندازیاری ئاوێ؟ بچێ لەسەر ڕووباری دیجلە بەنداو دروست بکا و ئاراستەی ئاوەکە بەملا و ئەولادا ببا و هەموو دەشتی دیاربەکری پێ ئاو بدا و تۆش هەر برێ شۆخی دەکەی؟ وەلێ ئەو سوحبەتە وەك گاڵتەی ژێر دوو تەنەکە ئاوی ژەنگاویی هەژاران نییە ها.

ڕەشۆ – مامە گیان ئاوی دیجلە زۆر قووڵە، چۆن دەتوانن ئەو ئاوە بگەیەننە دەشتاییەکانی دیاربەکر؟

سەعدۆ – گەنجۆ، بەدۆ لە من باشتر دەزانێ. وەلێ ماڵی بەگ چۆن لە مەرزکردنی برنجدا، ناهێڵن قومە ئاوێك بۆ کەس بڕوا، ئەوەش هەر شتێکی لەو بابەتەیە. وەلێ ئیدی ئەو ئاوە تەنیا بۆ بەگەکان نابێ. بگرە تەواوی هەژار و نەداری دەشتاییەکانی دیاربەکرێ سوودی لێ دەبینن. ئاخر لەبەر برنجی بەگان، ئێمە لە بێ ئاوی خنکاینە. سەیرکە، ئافرەتەکانمان هەموو ساڵێك دووگیان دەبن، وەلێ منداڵەکان تەمەنیان درێژ نابێ، چونکە ئەو

بەگانە، برنجەکە بۆخۆیان دەبەن و مەلاریا و نەخۆشییەکەشی بۆ ئێمە جێ دەهێڵن.

کەلۆس – وەڵڵا دیسان ئەو ئاغا و بەگانە، بە فرتوفێلان مەرەزەی خۆیان دەکەن و ئینجا ئێمەش وا بڕوات بە یەکجاری منداڵمان نامێنێ.

بەدۆ – جا مامە کەلۆس گەر وا بێت، ئیدی حوکمەت وەك ئێستا ئەو گوندانە لە بەگ و ئاغاکان دەستێنێتەوە.

برۆ – ئاخر حوکمەت چی پێ دەکرێت بەدۆ؟ کێ دەتوانێ ئەو ماڵە لە ماڵی بەگی ئێمە بستێنێ؟ پارەکە، ئەها تۆزێك لەولاتر، فاتێ دار توویەکی لەپێش ماڵی خۆی چاندبوو، بەگیش هاتوو دیتی، هەر بە دەستی خۆی هەڵیقەراند و فڕێی دا. فاتێ گریا و گۆتی بۆچی ئەو دارەت لێ هەڵقەراندم؟ بەگیش لە وەڵامدا پێی گوتبوو: "دەبڕۆ ئەولا، ئاخر بەیانی کوڕەکەت دەڵێ دارێکم لەو گوندەی هەیە".

ڕەشۆ – پەح پەح، جا بەو بەگەی ئێمەش دەڵێن دیموکرات.

سەرۆخان – بێ لە سوحبەت، مامە سەعدۆ، ئەدی کاتی خۆی بەگی ئێمە لەناو پارتی گەل نەبوو؟

سەعدۆ – بەڵێ ڕاستە کوڕی خۆم، وەلێ هەر زوو بووە دیموکرات. ئاخر ئەوان هەر ئاوان. چەوریەکە لە کوێ بێ، ئەوان لەوێن. یانی ئەو بەگ و ئاغایانە وەك مێشومەگەزن، لە دەوری شیرینی کۆ دەبنەوە.

بەدۆ – یابۆ ڕەنگە پێش ئەوە حوکمەت ئەو گوندانە لە بەگەکان بکڕێتەوە.

برۆ – چی چی؟ یانی بەگ گوندی خۆیان دەفرۆشن؟

بەدۆ – بە دەست خۆیان نییە.

سەعدۆ – ڕاوەستە کوڕی خۆم ڕاوەستە. باوکت لە تۆ ناگات و با من تێیبگەیەنم. برۆ سەرەتا دەبێ حوکمەت بە پارەی خەزینەی، ئەو گوندانە لە بەگ و ئاغایان بکڕێ و دواتر بیفرۆشێتەوە ئێمە. وەك چۆن لە شاران قەسروقسوران دەکڕێ و دواتر تێکیان دەدا و دەیانکاتە ڕێگا؛ ئەوەش وەها دەکا.

ڕەشۆ – ئاخر مامە گیان، گەر حکوومەت عەرزیشمان بفرۆشتێ، ئەی ئێمە بە چی بیکڕین؟

بەدۆ – مامە گیان بە تەقسیت دەتفرۆشیتێ.

برۆ – بەدۆ ئەو تەقسیتە چییە؟

سەعدۆ – بەدۆ کوڕی خۆم، ئەی من پێم نەگۆتی باوکت لە تۆ ناگا؟ کوڕە تەقسیت یانی قست قست. یانی حکوومەت بە قەرد ئەو زەوییانەمان دەفرۆشێتێ. ئێمەش ساڵانە شتێك لەو قەردە دەدەینەوە حکوومەت، تا قەرزەکەمان لەسەر تەواو دەبێ. جا هەندێك جار ئەو قەردە تا بیست ساڵان بەردەوام دەبێ. ئیدی ئاوا، تا قەرزەکە تەواو دەبێ. ئیدی خەڵك ئاوا دەبنە خاوەن زەوی و بەگیش دەگەنە حەقی خۆیان.

کەلۆس – حەقی چی ئاپۆ؟ وەڵلاهی نیوەی ئەو بەگانە، بە فرتوفێڵ و تەڵەکە ئەو گوند و زەویوزارەیان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیان. هەمووی ماڵی حکوومەتە. بۆیە گەر حکوومەت هیچیشیان نەداتێ ناحەق نییە. ما کەس هەیە بتوانێ ماڵی دزیاری بکڕێ و بفرۆشێ؟ ئاخر خۆ تۆ باشتر دەزانی، وەلێ کەینێ لە

گونـدەکانی (سـەرڕەش و قەرەبەتلـی و بەرئـاوێ و بەڕۆژێ و ڕەشوانێ و ئۆمەر و زڤینگێ) کـڕین و فرۆشـتن عـادەت بـووە؟ ڕەحمەتـی بـابم دەیگـوت، ئەو زەوییـانە هەمـووی بە زۆر لە خەڵکی زەوت کراون.

برۆ — وەڵڵا من باوەڕ ناکەم حکوومەت گونـدی لە بەگ و ئاغایـان بسـتێنێ و بیـداتە ئـێمە. ئـاخر مـن خـۆم سـەدان جـار دۆستایەتی و برادەرایەتیی نێوان بەگ و سەروان و بەڕێـوەبەری نـاحییەم دیتیـیە. جـا ئەوان چـۆن گونـد لە بەگ دەسـتیننەوە و دەیدەنە ئێمە؟ بۆیە، بەدۆ بێتە دختۆر باشترە. خۆ هێشتا نەبـووەتە ساڵێك، کچەکەی تۆ بەو برینە ڕەشە کۆچی دوایـی کـرد. ئەی ئەگەر دختۆر هەبا دەمرد؟!

زینۆ — وەڵڵا بە بۆچوونی منیش دختۆری باشترە.

سەعدۆ — بەدۆ کـوڕی خـۆم، وەڵـڵا خەریـك بـوو لە بیـری بکەم. ئەرێ ناڵێن ئەو برینە ڕەشە چییە و لە چـی پەیـدا بـووە؟ جـارێکی گوتیـان لەو گەنـمە دەرمـانکراوەی دابەش کـراوە پەیدادەبی. ئەرێ هێشتاش ئەو گەنمە دابەش دەکرێ؟

بەدۆ — ڕاستە مامە گیان، ئەو دەردە لەو گەنمە دەرمـانکراوە دروست دەبێ و حکوومەتیش تا ئێستا هەر دابەشی دەکا.

سەعدۆ — خۆ بینیوتـانە لەدەسـت ئەو بەگـانە چیمـان بەسـەر هاتووە؟! حکوومەت بۆ چاندنێ بنەتۆیان دەداتێ، کەچـی ئەوان نایچینن و دەیفرۆشنەوە. بە خوا تا گوندیان لەدەست دەرنەهێنن، کەس لە حەقیان نایەتە. جا بۆچی ئەو گونـدییانە ئـاوارەی شـار بن؟ وەك ئەوەی لە شار خانوو و باڵەخانەیـان هەبـێ! نـاوەڵڵا بـا بەگ و ئاغاکان بچنە شار و گوندییەکانیش لە گونـدی خۆیـان بمێننەوە.

بەدۆ – مامۆ منیش ڕۆژێك پرسیم، دەیانگوت حكوومەت لە تەنێك یان تەن و نیوێك زیاتر گەنم ناداتە كەس. نازانم ئەو بەگانە چۆن دەتوانن سەت تەن دەست بخەن؟ لە مەكتەب كوڕە شێخێك برادەرم بوو، لەوبارەیەوە دەیگوت "ئەوساڵ بابم دوو سەت تەن گەنمی لە سایلۆ وەرگرت". نازانم ئەوە چۆن دەكرێ؟

سەعدۆ – كوڕی خۆم زۆر ئاسانە. ئێستا ئەو بەگانە لیستێكیان بە ناوی گوندیيانی لادێ نووسیوەتەوە و شتێكی وەكوو ختمی موختاریشیان دروست كردووە و دەچن بە ناوی هەر كەسێك نزیكەی تەن و نیوێك وەردەگرن، لە كاتێكدا گوندی ئاگایان لە هیچ نییە. ڕۆژێكیش ئەو فەقیرانە لە پشتی تراكتۆرێك سوار دەكەن و دەیانبەن لە سایلۆ پەنجەمۆرێكیان پێ دەكەن. بەو شێوەیە گوایە هەر كەسە و مافی خۆی وەرگرتووە. بەڵام ئەو گوندییە قوڕبەسەرانە، كوو دەچن، ئاواش بە دەستبەتاڵی لە پشتی تراكتۆر دەگەڕێنەوە گوندی. دواتر خاوەنی ئەو گوندانەش، بێ ئەوەی مشتێك گەنم بدەنە گوندییەكانیان، هەمووی بۆ خۆیان دەفرۆشن. بۆیە، بەدۆ بەسەری تۆ، ئەو بەگانە ئەو ١٠٠ یان ٢٠٠ تۆنەی باسی دەكەی، هەمووی بەو شێوەیە وەردەگرن.

زینۆ – یاخوا خوا لێیان هەڵنەگرێ.

برۆ – ئێوە سەیری عەقڵی زینۆ بكەن، كچێ بە خوا ئەوان هیچیان لێ نایێ. ئاخر ئەوان وەك قایش ڕەش بووینە، بۆیە هیچ دوعایەك كاریان لێ ناكا.

سەعدۆ – ئاخر كوڕی خۆم، ئێمە چیمان لەدەست دایە؟ دە

بۆیە کاتەکەی درەنگ بووە و با هەڵستین، هەرچەندە زۆریشم حەز لێیە دانیشم.

(میوانەکان هەڵدەستن و خاوەن ماڵیش بۆ بەڕێکردنیان هەڵدەستن)

بەدۆ – مامە گیان هێشتا زوو بوو، بۆ هەڵستان؟ مەجلیس و دەمودووی تۆ زۆر خۆشە ئاپۆ.

سەعدۆ – خوا عەمر درێژت بکا ئینشاڵلا. ئاخر ئێمەی فەقیر چ خۆشیمان نەدیتییە تا باسی بکەین. وەلێ نامەوێ لەوە زیاتر بە قسەکانم بێتاقەتت بکەم. چونکە گەر بمەوێ باسی ئەو ماجەرایانە بکەم کە حەفتا ساڵە دیتوومن، ڕەنگە ئاوی ڕووبارانیش بوەستێ.

دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، بەدۆ بێبەرامبەر، لە بەشە ناوخۆیی قوتابییانی دیجلە لە ئیستانبوڵ دەماوە و بەشی پزیشکی تەواو کردبوو و ببووە پزیشك. دواتر لە نەخۆشخانەی فێرکاریی حکوومیی دیاربەکر دامەزرابوو. لەوێ خانوویەکی بە کرێ گرتبوو و دایك و باوکیشی هێنابووە لای خۆی.

**شوێن:** لەبەر هەیوانی ماڵەکەی دیاربەکری زینۆیە. زینۆ حەوش و هەیوانی ماڵەکەی، وەك ماڵی بەگەکەی ڕێك خستووە. زینۆ لە دوو لاوە نیمندەری داناوە و لە ناوەڕاستیش مێزێك هەیە. سۆری سبەینێیە و دایك و باوك و کوڕ، بە کەیفخۆشی لە دەوری مێزەکە کۆبوونەتەوە و تاشتی دەخۆن.

**جل و بەرگەکان:** زینۆ فستانێکی تازەی باژێڕیی لەبەردایە. سەرپۆشێکی کەتانی تەنکیشی لەسەر کردووە. نەعلێکی شارستانییانەشی لە پێدایە.

برۆ ڕیشی خۆی کورت کردۆتەوە. شەبقەیەکیشی لەسەری کردووە و دەستێك جلی نوێشی لەبەردایە. لەگەڵ کراسێکی بێ بۆینباخ.

بەدۆ کراسێکی نیوقۆلی سپی و پانتۆلێکی نوێی ئوتووکراوی پاقژی لەبەرە.

ســـــەرمێزەکە بە چەنـــــد جۆرێـــــك خـــــواردنی جیـــــاواز ڕازێندراوەتەوە. زینۆ چای بۆ بـرۆ تـێ دەکـات. لەوسـەروبەندە پەردە دەکرێتەوە.

* * *

برۆ – زینۆ بە ناوی خوای، هەموو بەیانیان من لەو تاشتییەی تۆ عێدزم. ئاخر وەك ڕۆژی جێژنە، من لەناو ئەو هەموو قاپ و قاچاغە گێژ بوویمە.

زینۆ – ئەی باشـە بـرۆ مـن چیـت بـدەمێ؟ هەمـوو مـاڵێکی شارستان، بەیانیان هەر ئەو شتانە دەخۆن.

برۆ – شارستان هـا! ئـاخر ئـێمە کەی شارسـتانین؟! کـوا ئەو دۆیە سارد و ئەستوورکە گەرمەی بەیانیان؟! بریا هەبا، جـا قەینـا لە ئاردی جۆش با چ کێشە نەبوو.

زینۆ – کوڕی خۆم گوێت لەو قسانەی بابتە ؟ ئاخر برۆ، من نانی سەر سێلێ لە کوێ بۆ تۆ بینم؟ تاشـتی بەگـانیش هەر وەك ئەوەی ئێمەیە. نڤیشك و زەیتوون و پەنیر و مرەبـا و چـا و نـانی فرنییە و تەواو. گەر باش نەبووایە، بەگیش نەیاندەخوارد.

برۆ – هەیهوو هەیهوو، دیسان ناوی بەگ و ئاغایانی هێناوە. وەڵلا زینۆ کەس لێت تێناگا. ئاخر تۆ دەڵێـی بەگ بـاش نـین و خواردنیان باشە! جلەکانیشت وەك ئەوان لـێ کـردووە. پێشـتر لە گوند زۆر موڕتاح بووم. کراس و دەرپێیەکـی فـش و ڕەحەتـم لەبەربوو. چونکە ئەوکات هەرچیم کردبا پێـیەوە ڕەحەت بـووم. کەچی ئێوە منتان هێنا و خستمتانە ناو ئەو کیسانە.

(برۆ پانتۆڵ و کراسی خۆی پیشانی زینۆ دەدا)

برۆ – ئەو جلانەت لەبەر کردین، چونکە وەك کنجی بەگانە. ئاخر تخوا شاڵوشەپکێ من کەی وەك ئەو جلە تەنگانە بوو؟ بەدۆی خۆم، تووخوا قسەکانم وە نینە؟

بەدۆ – (بە پێکەنین و خۆشییەوە) یابۆ من لە کوێ بزانم؟ وەڵلا ئێوە هەردووکتان ڕاست دەکەن.

زینۆ – ئاخر کوڕی خۆم، من ئەستوورکی سێل و دۆ لە کوێ بۆ باوکت بێنم؟!

بەدۆ – یادێ، تووخوا بابم چی گۆت، با بەدڵی ئەو بێت. چی دەخوا و چی لەبەر دەکا، ئەو بە خۆی دەزانێ. ئەوەی پێی ڕازی نینە، با کچی خۆیان نەدەنە کوڕەکەی...

زینۆ – دە هۆش کوڕە هۆش، ئاخر بابی تۆ چی دەزانێ؟

برۆ – وەڵلا ڕاستە زینۆ، ئاخر گەر من شتێکم لەو دنیایە زانیبا، قەت تۆم دەهێنا؟!

بەدۆ – ئای، دایە و بابە...

زینۆ – نا نا کوڕی خۆم، ئەو باوکەی تۆ بووەتە ئاگر و لە من بەر بووە. بەردەوام چاوی لەسەر دەوی منە.

برۆ – درۆ... جگە لە خانمی گەورە و ماڵی بەگ، من کەی لە قسەی تۆ عێدز بوویمە. ئەوە بووە چل ساڵ ناوی خانمی گەورە و ماڵی بەگ لە ماڵی ئێمە و لە زاری تۆ نەبڕاوە.

(بەدۆ لەبەر خۆیەوە لەژێر لێوییەوە، بە بێ ئەوەی دەنگی بگاتە دایکی)

بەدۆ – باوکم ناحەق نییە.

زینۆ — باشە ئێوە دەزانن، من چ هەقم بەسەردایە.

برۆ — چۆن؟ وەڵلا تۆ هەقت بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە.

زینۆ — برۆ وەڵلا من چ ئیشم بە تۆ نییە. بەدۆ کوڕی خۆم، دە تۆ تۆزێك باسی بەشە ناوخۆیی دیجلەمان بۆ بکە، کە لە ئیستانبوڵ لێی دەمایەوە. ئەو خوێندکارانەی لەوێ بوون، هەموویان وەك تۆ هەژار بوون؟

(زینۆ، بە پێکەنینەوە، سەری دەباتە بن گوێی بەدۆ و بە پێکەنینەوە پستەپستێکی لە بن گوێی دەکا)

زینۆ — بەدۆ بیرم چوو پێت بڵێم، ئەو ڕۆژە خانمی گەورە هاتبووەماڵمان. تا ئەو کاتەی ڕۆیشتیش، هەر باسی تۆمان دەکرد. فیغانی کچی بەگ، ئەوساڵ قۆناغی ئامادەیی تەواو کردووە.

برۆ — لاوی خۆم سەیرکە زینۆ چ ژنێکە. کەی باسی خانمی گەورە بکا، پێدەکەنێ، وەلێ دەیەوێ ئەو پێکەنینەی لە ئێمە بشارێتەوە.

بەدۆ — نا بابە، شتێکی نە گەلەك هێژایە. دایە گیان، وەڵلا من چ ئیشم بە فیغە و میغەی نییە. من کوڕی عەیشێ و فاتۆیمە. عەشقی من ئێوە و نەخۆشەکانمن. ئەو هەژار و نەدارە نەخۆشانەی، دەیانەوێ بە فرتوفێڵان پێستیشیان لەبەرداکەنن. جاری وا هەیە، منداڵ و نەخۆشی وەها دێنن تووشی برینی ڕەش بووینە و پێست چییە بە گیانیانەوە نەمایە. گەر فیغەش مەکتەبی تەواو کردووە، با بە کامی دڵی خۆی، تێروپڕ جلی ئاوریشمی بۆ خۆی بدوورێ.

زینۆ – ئاخر کوڕی خۆم، ئەوە چەند ساڵە خانمی گەورە چاوەڕێی تۆ دەکا و لەبەر تۆ ئەو کچەی هێشتۆتەوە.

برۆ – زینۆ دیسان ناوی خانمی گەورەت هێناوە؟

بەدۆ – ئەرێ یادێ ئەرێ، خوێندکارەکانی ئەو بەشە ناوخۆییەی تۆ پرسیت، هەمووی قوتابیی هەژاری ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بوون.[1]

زینۆ – کوڕی خۆم ئەو بەشە ناوخۆییە هی کێیە؟

بەدۆ – هی کەس نییە دایە گیان. قوتابیانی ڕۆژهەڵات زۆربەیان لە ئیستانبوڵ دەخوێنن و هەر ئەوانیش دروستیان کردییە. هەموو ئەو گەنجانەی لەوێش کار دەکەن خۆبەخشن. بەڵام هەر یەکێک لە شارەوانییەکانی شارەکانی ڕۆژهەڵات تۆزێك پارەیان بۆ دەنێرن، ئیدی بەشە ناوخۆییەکە بەو شێوەیەی بەڕێوە دەچێ. وەلێ زۆر بە داخەوە، ئەو بەشە ناوخۆییەی بە قەد مەرقەدێك پیرۆز بوو، ئێستا داخراوە.

زینۆ – زۆر بە داخەوە. ئەی کوڕم نەماندەتوانی شتێك بکەین تا داینەخەن؟

بەدۆ – وەڵڵا یادۆ ئێمە و چەند دۆستێکیش هەر ئەوهامان گوت، بەڵام سەری نەگرت.

برۆ – (بە هێمنی و خەنینەوە) بەڵێ زینۆ، خۆ خانمی گەورەی تۆش، بەشە ناوخۆیی ئاوەها دەکاتەوە و قوتابییانی هەژار دەخاتە بەر خوێندن.

[1] مەبەستی ناوچە کوردییەکانی باکووری کوردستانە لە تورکیا. (وەرگێڕ)

زینۆ – کوڕی خۆم تۆ سەیرێکی برۆی باوکت بکە! ئەی تۆ نەبووی تا ئێستا دەتگوت خوێندن باش نییە؟

برۆ – ئەوەی من جیایە؛ چونکە من نەمدەزانی. وەلێ ئەوان لە دووڕووییان، ببوونە دوژمنی خوێندن. بۆیەش نەیاندەهێشت کەس بچێتە بەر خوێندن. جا گەر فەقیرێك، بە هەژاری و نەداری چووبا مەکتەب و خوێندنی تەواو کردبا، ئەوان هەموو حیلەوحەواڵەی خۆیان بەکار دەهێنن تا ئەو کەسە ببەنە بەرەی خۆیان. جا کە دەکەونە تەنگایی، دەیانەوێ کچەکانی خۆیان بدەنە ئەو لاوانە. یانی دیسان دەیانبەنەوە لای خۆیان. بۆیە ئێستاش نۆرەی ئێمەیە. زینۆ هەر لەبەر هەندێیە خانمی گەورەت جرتوفرتیتی و زوو زوو سەرت لێ دەدا. فیغانومیغانیش هەر لۆ ئەو مەبەستەیە.

زینۆ – برۆ دەبەسە تووخوا. ئاخر کوڕی خۆم ئەوە کەی قسەیە، وەك ئەوەی من شتێکم گوتبێ.

برۆ – وەڵلا گەر بە من بێت، کچی ماڵی فەرمانی بۆ دێنم، لە سەت فیغان و میغانی باشترە.

بەدۆ – دایك و باوکی خۆشەویستم، من چۆن لە کۆمەڵ و دەستەی خۆم دادەبڕێم؟ "هەموو باڵندەیەك لەگەڵ ڕەوەی خۆی دەفڕێ". چونکە من دەزانم، گەر بزن لە پەزی خۆی دابڕێ، یان گورگ دەیخوا، یان دەدزرێ. من کوڕی گوندییانم، من کوڕی زینۆ و برۆیمە. بۆیە بە دڵنیایەوە، دەستگیرانی منیش، یان خەجێ، یانیش زینێ دەبێ. ئاخر ئێمە لە کوێ و فیغان لە کوێ؟!

برۆ – کوڕی خۆم، هەرچەندە دەڵێن چیرۆك و حیکایەت بە

سـبەینان گێڕانەوەیـان بـاش نیـیە، وەلـێ بـا مـن سـەربردەیەکی کورتتان بۆ بگێڕمەوە:

دەڵێن ڕۆژێك، کەوێك و قەلەڕەشێك عاشقی یەکدی دەبـن و دەچنە لای پێغەمبەر سلێمان و دەڵێن ئێمە لەیەك مارە بکە. نەبی سلێمانیش پێیان دەڵێ: مـن نـاتوانم مارەتـان بـکەم، بەڵام هەڵستن و بـڕۆنە لای باڵنـدەی چاوشـی مـن و ئەو کـارانە لای ئەون. بڕۆن و با ئەو لەیەکتان مارە بکات. بە کەیف و خۆشـی، کەو و قەلەڕەشەکە دەفڕن و دەچنە لای ئەو باڵندەی حەزرەتـی سـلێمان، ئەوانـی ڕەوانەی لای ئەو کردبـوو. کە دەگەنە ئەوێ، حـاڵ و حیسـابی خۆیـان دەگێـڕنەوە. وەلـێ باڵنـدەی چـاوش، عەقڵی دۆخەکە ناگرێ و لە نهێنییەکەی تێناگات. بۆیە تا زمـانی شل دەبێت، ئامۆژگـاریی هەردووکیـان دەکـا و دەڵـێ ئەو ئیشـە نـابێ، وەلـێ هەردوو باڵنـدە عاشـقەکە باوەڕیـان نـایێ؛ بـۆیە چاوشەکەی حەزرەتی سلێمان پێیان دەڵێ:

- مـادام وایە سـەیر کەن، بـزانم ئەو تـاوێرەی سـەر ئەو گردەی ئەوسەری دەبینن؟ هەڵستن چەند جارێك تا ئەوێ بفـڕن و وەرنەوە ئێرە، ئینجا شتێکتان پێ دەڵێم.

هەردوو عاشـقەکە، واتـا قەلەڕەش و کەوەکە، بە کەیـف و خۆشی لە شەقەی باڵیان دا و بەرەو تاوێرەکە فڕین. قەلەڕەشەکە زۆر بە خێرایی تـا سـەر تـاوێرەکە دەفـڕێ و بـلەز دەگەڕێتەوە. وەلـێ کەوەکە، کـارەکەی بە زەحـمەت دەکـا و پتریشـی پـێ دەچی تا دەگەڕێتەوە. ئەوجـا باڵنـدە چاوشـەکە دەڵـێ: مـارەیی ئەوانەی خێراییـان وەك یەك نیـیە، حەڵاڵ نیـیە. بەو جـۆرە دوا بڕیاری خۆی لەبارەی بابەتەکە دەدات.

زینۆ – بەدۆ خۆ بابی خۆت دەبینی، شتێك گەر بە دڵی وی بێت چەند عاقڵ و هۆشمەندە. وەلێ بۆ منێکی هەشبەسەر، هەر بێعەقڵە.

برۆ – کچی زینۆ من چیم لە تۆ کردووە؟ ئاخر چل ساڵە ئێمە سەپانی بۆ خەڵك دەکەین. ئێ دە پێم بڵێ چۆن عەقڵمان لەسەریدا بمێنێ؟ ئاخر جاری وا هەبووە بە مانگیش لە گاجووتەکانم بترازێ، چرۆچاوی یەك بنیادەمم نەدەدیت. جاری وا هەبوو قسەشم بیر دەچۆوە. ئاخر لە "هۆ هۆ، وەخە هەڕە" زیاتر مێشکم نەدەچووە سەر وشەیەکی دی. ئەدی بە بیرت نایەت لە بەهاران، چەند ماندوو بووم و شەوان خەو نەدەچووە چاوم؟ بە ڕۆژیش نەدەهاتمەوە ماڵ و هەر لە ئاقاری بووم. بیرتە تەنیا جارێك هاتمەوە ماڵ، لە بەدۆ دوور بێت، کوڕی گەورەمان کۆچی دوایی کردبوو. وەلێ تا گەیشتمەوە گوند، ئێوە ئەوتان شاردبۆوە، یانی بێ ئەوەی ماڵئاوایی لێ بکەم لە گۆڕتان نابوو!

(زینۆ نایەوێت ئەو ڕۆژانە بە بیرە خۆی بێنێتەوە. لەبەر گێڕانەوەکانی برۆش، چاوی فرمێسکی تێ زاوە، وەلێ هەوڵ دەدا بیشارێتەوە. بەدۆش کە بینیی دایکی لە دۆخێکی ئاوا ناهەمواردایە، دەستی لە ملی کرد و سەر گۆناکانی ماچ کرد).

زینۆ – دە بەسە برۆ، تۆش هەر ئاوای. ئەی چی بکەین؟ خوا بەدۆم بۆ بهێڵێ و ساغ و سەلامەت بێ ئینشاڵڵا.

برۆ – وەڵڵا زینۆ قسەکانت دۆغرییە.

بەدۆ – (بە پێکەنینەوە) ماشەڵڵا دەبینم ئێوەش قسەتان بووەتە یەك.

زینۆ – (بەشەرمەوە) نا نا لاوۆ، من لەگەڵ ئەو بابەتە چی بکەم؟!

برۆ – (خەندەی لەسەر لێوانە و سمێڵی خۆی خاوێن دەکاتەوە) وەڵڵا بابی من وایە. جا زینۆش منەت بەسەر کوڕەکەمدا دەکا.

بەدۆ – یابۆ ئاخر دایکی منیش هێژای منەتێیە.

زینۆ – منەتی چی و حاڵی چی، ئەوە کاری باوکتە.

(تاشتی خواردن تەواو بووە و زینۆ سفرەکە کۆ دەکاتەوە. بەدۆش لەو کارەدا هاوکاریی دایکی دەکا و برۆش بۆ داگیرساندنی جگەرەیەك، سیغارەکەی دەپێچێتەوە. لەو سەروبەندەیدا، دەرگای حەوشەیان دەکرێتەوە. ژنێکی فەقیری گوندیی سەر بە کۆفیی پینەکراو، کوڕێکی لە پشتێیە، کە تووشی برینا ڕەش بووە. ژنەکە لە دەرگاوە دێتە هوندوروو، تا دەگاتە بەرهەیوان. ئافرەتەکە ناوی خەنسێیە).

خەنسێ - ئەفەندی ئێرە ماڵی دختۆرە؟

بەدۆ – بەڵێ دایە گیان.

خەنسێ – کوڕی خۆم مادەم وایە بە خێری خۆت بانگی دختۆری بکە.

بەدۆ – کەرەمکە دایە، من دختۆرم.

خەنسێ – کوڕە دە واز بێنە و گاڵتەم پێ مەکە. ئاخر کاتی شۆخی نییە، وەك دەبینی کوڕەکەم حاڵی پەرێشانە.

بەدۆ – وەڵڵا سوحبەت ناکەم دایە گیان، ئاخر من کوێم بە دختۆران ناچێ؟! بە ڕاستیمە و من دختۆرم.

خەنسێ – وەی لەو عەجایباتییەی! چۆن دەبێ دختۆر کورد بێ؟!

بەدۆ – ئێ بۆ نابێ؟ ئەی ئەوە نییە من دختۆرم.

خەنسێ – ئاخر بابم دەیگوت ئەو دختۆرەی دەچییە لای دختۆرێکی زۆر چاك و گەورەیە.

بەدۆ – وەڵڵا نازانم چییان گۆتییە، وەلێ من دختۆرم.

خەنسێ – سەت جار ماڵی خوا ئاوا. ئەوجا لەناو کوردانیش دختۆر پەیدا دەبن.

(خەنسێ هێشتا کوڕەکەی بە پشتێوەیە و لە خۆشییان شاگەشکە بووە. لە لایەك نزا دەکا و لە لایەکی دیکەش دەیەوێ کوڕەکەی لە شوێنێك دانێ و لەبەر خۆشییەوە قسە دەکات. زینۆش کە ئەو دیمەنە دەبینێت، ژیانی پڕ چەرمەسەری و کولەمەرگی ساڵانی ڕابردووی وەك شریت دێتەوە بەر چاو و بە گریان و خەندە و سەرسوڕمانەوە بیر دەکاتەوە).

زینۆ – ئەرێ خوشکی من، چۆن دختۆری کوردان نییە؟ کێ بچێتە مەکتەب و بخوێنێت، دەبێتە هەموو شتێك. جا کورد

بێت یان هەر شتەکی دیکە وەك یەکە. ئەی کێ بە تۆی گوتووە کورد نابنە هیچ؟! ئەی تۆ نابینی ئێستا نیوەی مەئموور کوردن؟ وەلێ ئەو ڕەبەنانە لە ترسان ناوێرن خۆیان دەرخەن.

خەنسێ — وەللا ڕاستە خوشکێ. ئەوێ سالێ حکوومەت هات تا قوتابخانەیەك لە گوندەکەی ئێمە بکاتەوە، وەلێ ئاغای خاوەنی گوندەکەمان، ڕێگای نەدا و هات و بە ئێمەشی گوت "کورد نابێتە هیچ، بۆیە چی لە مەکتەب و خوێندن بکەین؟!"

بەدۆ — نا دایە گیان، ئەوەی دەڵێن هەمووی درۆیە.

خەنسێ — باشە کوڕی خۆم باشە، وەللا ئیدی بە گوێی تۆ دەکەم.

زینۆ — ئەی ئەو کوڕەت چ خێریەتی؟

خەنسێ — خێر بێتە سەر ڕێگای ئێوە ئینشاڵلا. وەللا من ئەو کوڕەم هێناوەتە لای دختۆر.

برۆ — زینۆ ئەو ژنەتان لەسەر لینگان هیشك کردەوە، دە لاچۆ با دانیشێت.

زینۆ — برۆ ڕاست دەکەی قسەی تۆیە. خوشکی من کەرەمکە و دانیشە و کوڕەکەت بۆ دختۆر بکەوە.

(ئافرەتەکە بە ترس و شەرمەوە منداڵەکە دەکاتەوە و سەیری بەدۆ دەکات)

خەنسێ — ئەی ڕەبی من بیمە قوربانی هەمووتان.

(بەدۆ لە کوڕە نەخۆشەکە نزیك دەبێتەوە و دەستی دەگرێ. دوای کردنەوەی جلەکانی، دەبینێ منداڵەکە بە هۆی برینی ڕەشەوە هەموو گیانی ڕەش هەڵگەڕاوە و زۆر پەرێشان و بێحاڵە).

بەدۆ — ئەو کوڕە جوانەت زۆر نەخۆشە ها؟ با سەیرێکی بکەم... نا نا کوڕی خۆم هیچت نییە، من وەك برای گەورەی تۆم، کا هەردوو دەستەکانتم بدەرێ. ئۆۆ... ماشەڵلا هیچت نییە. بەیانی بیهێنە نەخۆشخانە، ئەلەمی نامینێ ئینشاڵا.

خەنسێ — لەسەر سەرت گەڕێم دختۆر گیان، ناوەڵلا دەمەوێ لێرە چارەسەری بکەی. بە سەری تۆ من چوار منداڵم خستۆتە بن عەرز و هەر ئەوەم مایە. بۆیەش نایەم، چونکە دەڵێن لە بیمارستان گوێ بە هەژاران نادەن.

بەدۆ — نا دادە گیان نا، درۆ دەکەن، چونکە نەخۆشخانە خۆی جێگای هەژارانە. لەوێش هەر خۆم دەرمانی دەکەم.

زینۆ — کوڕی خۆم قسەی خەنسێ دۆغرییە. ئاخر خۆ هەمووی وەك تۆ نین. هەژاریش لەو نەخۆشخانانە چاوترسای بووینە.

خەنسێ — دختۆرە فەندی، لە خوشکی خۆت بنۆڕە، من بە دەستبەتاڵی نەهاتوومە. بە سەری تۆ و ئەو کوڕەم، لە بەهارێوە هێلکەی دەفرۆشم، لەگەڵ ئەوەی مریشکێکیشم لە هێلکەکردن چووبۆوە. بەلام هەڵستام ئەویشم بە دە مەجیدی فرۆشت. ئیدی

بە پارەی هێلکەکان و ئەو مریشکەی، هەمووی کردییە نۆزدە لیرە. سەر و ماڵم ئەوەندە پارەیە، وەلێ با کوڕەکەم ڕزگار بێ، سەر و ماڵم قوربانی بێ.

بەدۆ – نا دایە گیان نا، کوڕەکەت بێ پارە چارەسەر دەکەم.

خەنسێ – هەر لەبەر ئەوەی پارەکە کەمە لێم وەرناگری؟! ئاخر نەدارێکی وەکوو من چ بکا، تیلا هەر ئەوەندەم هەیە. ڕاستە پارەکەم زۆر نییە، بەس خوا دەزانێ هەر ئەوەندەم هەیە. هەژاری، ماڵی ئاوا نەبێ. ئێوە ئەو دۆخەتان بەسەر نەهاتووە و نازانن، فەقیری زۆر زەحمەت و قورسە، خوا بە قسمەتی کەسی نەکا.

(زینۆ هەمدیسان ژیانی عومری ڕابردووی وەك شریت دێتە بەر چاوی، دەستماڵەکەی لە باخەڵی دەردەهێنێ و ئەسرینی چاوەکانی دەسڕێ).

زینۆ – نا خوشکی خۆم نا، لەبەر ئەوە نییە کە پارەکە کەمە، وەلێ کوڕی من پارە لە کەس وەرناگرێ بۆ چارەسەری نەخۆشی.

خەنسێ – یاڕەبی خودا من بکاتە قوربانی سەری تۆ، کوڕی خورت. ئەی مەتێ دختۆر چی تۆیە؟!

زینۆ – کوڕمە.

خەنسێ – یاخوا، خودا دەست بە باڵاییەوە بگرێ و بۆ تۆ و

بۆ ئێمەی بهێڵێت. بۆیە ئێمە دەڕۆین و بەیانی کوڕەکەم دەهێنمە نەخۆشخانە.

بەدۆ — دادە گیان ئێوە دەچنە کوێ و شەو لە کوێ دەمێننەوە؟

خەنسێ — تۆ ساخ بی، شوێنێکمان بۆ چەند شەوان لە کاروانسەرا بە کرێ گرتووە. دوو مەجیدیم داوە، یەکێك بۆ کەرەکەم و یەکێکیش بۆ خۆم.

بەدۆ — چی چی؟! دادە گیان نابێ ئەو کوڕە نەخۆشە ببەیە کاروانسەرا.

خەنسێ — ئەی چی بکەم کاکی من؟ ئاخر نازانی شوێنی کەسانی وەك ئێمەی فەقیر لە شار، هەر کاروانسەرایە؟

(بەدۆ بە ئەسپایی لەگەڵ دایکی چەند قسەیەك دەکەن)

بەدۆ — دایە گیان با ئەوشەو ئەوماڵباتە بێنە لای ئێمە.

زینۆ — بێ شۆخی خوشکی خۆم، ئێوە ئەمشەو وەرن و لای ئێمە بمێننەوە.

خەنسێ — قوربانی ئێوە بم، من خزمەتکارتانم. وەلێ کەسێکی وەك من شایستەی ئەوە نییە شەو لاتان بمێنێتەوە. دوایێ کەرەکەشم لە کاروان سەرا بەستایەوە.

زینۆ — بۆ چی بووە؟ بچۆ بۆ کاروانسەرا و کەرەکەشت بینە و وەرەوە.

خەنسێ – (دیسان منداڵەکەی لەناو چەند پارچە قوماشێکی کۆنی دڕاو دەپێچێتەوە) یەڵلا سلۆ هەستە و وەرە سەر پشتم تا بڕۆین.

زینۆ – خوشکێ ناوت چییە؟

خەنسێ – خەنسێ، خاتوون.

زینۆ – خوشکی خۆم خەنسێ، کوڕەکەت مەبە تا زوو بچی و بێیتەوە.

خەنسێ – وەڵڵا ڕاست دەکەی، کاروانسەراش گەلێك دوورە. سلۆ کوڕی خۆم، تۆ لێرەبە و من ئێستا دێمەوە. جا کە هاتمەوە لە ڕێگا نانی گەنمت بۆ دێنم.

سلۆ – یادێ لە دختۆری دەترسێم، بۆیە منیش دەمەوێ بێم.

خەنسێ – مەترسێ کوڕی خۆم، دختۆر زۆر باشە. ئەویش لە ئێمەیە.

سلۆ – دایە زوو دێیتەوە؟

خەنسێ – هەر ئێستا دێمەوە. تۆ بۆ خۆت دانیشە و هەندەك یاری بکە. من وەك مەڕی قوربانی، لەسەر تۆ و دختۆری بگەڕێم. (خەنسێ دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە و نزا دەکات) ماڵی خوا سەت هەزار جاری ئاوا بێ بۆ ئەو ڕۆژانە. ئێمە تووشی یەکێك بووین لە زمانمان تێدەگات.

بەدۆ – (بەدۆ کورسییەکی خۆی دێنێتە نزیك سلۆ و لەگەڵی دەست بە قسان دەکا) ئێ گیانەکەم ناوت چییە؟

(سلۆ سەرەتا شەرم لە دختۆر دەکا و ڕووی خۆی لە بەدۆ وەردەگێڕێ)

بەدۆ – کوڕی خۆم ناوت چییە؟ من وەك مامتم.

سلۆ – ناوم سلۆیە.

بەدۆ – سلۆ تۆ باوکت نییە؟

سلۆ – چۆن باوکم نییە، وەلێ خولامی ماڵی بەگە.

بەدۆ – ئەهااا... خولامی ماڵی بەگە ها؟ وەڵڵا ڕاستە، ئەو فەقیرە ئەدی چ بی و چ بکا؟ سلۆ تۆ جەزت لە شەکرۆکەی نییە؟

(بەدۆ مشتێك نوقڵ و شیرینی دەداتە سلۆ)

سلۆ – (سلۆ سەیرێکی دەستی بەدۆ دەکات و دواتر بە هەردوو دەستان دەوی خۆی دەگرێ) نا نا، بە خوای ئەوە شەکر نییە و دەرمانە.

بەدۆ – کورە مەترسە بابی خۆم. بە سەری تۆ شەکرۆکەیە. تۆ دانەیەك بخە زارت و بزانە چەند خۆشە.

سلۆ – نا نا کاکۆ، ئاخر نوقڵ کەی وەهایە؟

بەدۆ – ئەی شەکرۆکە و شیرینی کووە سلۆ؟

سلۆ – وەڵڵا من جارێك شەکرۆکەم لە ماڵی بەگ بینی سپی بوو.

(بەدۆ چەند دانە قەندێکی چای بۆ دەهێنێ و پێی پیشان دەدا)

بەدۆ — ئەوە بوو سلۆ؟

سلۆ — ئەرێوەڵلا وەك ئەوەی بوو.

بەدۆ — قسەکەت ڕاستە سلۆ، وەلێ ئەوەش هەر شیرینی و نوقڵە. ئێ مادەم وەرە بەیەکەوە بیخۆین؟

(بەدۆ سەرەتا چەند دانەیەك لە شەکرۆکەکان و دواتریش دانەیەك لە قەندەکە دەخوا. سلۆش دوای ئەو دەست بە خواردنێ دەکا)

سلۆ — وەڵلا هەر بە ڕاستی شیرینە. (بۆیە پڕ دەداتە دەستی بەدۆ و تەواوی شەکرۆکەکانی لێ وەردەگرێ و لە کۆشی خۆی دادەنێ).

بەدۆ — ئەی من پێم نەگوتی شیرین و خۆشە.

سلۆ — نا نا، هەمووی ناخۆم. بابیشم گوناحە و هەندێکی بۆ دەبەمەوە.

زینۆ — (بە مات و مەلوولی، سەیری ئەو دوو کوڕە دەکات) سلۆ کوڕی خۆم، تۆ خوشك و برات هەیە؟

سلۆ — چۆن نیمە؟ دوو برا و دوو خوشکم هەبوو. وەلێ

هەموویان مردن و تەنیا من مایمەوە.

بەدۆ – ئەی باشە سلۆ تۆ ئەوە ناخۆیت؟

سلۆ – ئەی ئەوە چییە؟

بەدۆ – پرتەقاڵ.

سلۆ – پرتەقاڵ چییە؟ ناوەڵلا ئەوە گندۆرەیە.

بەدۆ – باشە سلۆ، دە مادەم وایە بیخۆ.

سلۆ – ناوەڵلا نایخۆم و بۆ خۆم یاریی پێ دەکەم. بۆ کاڵەك دەخورێ؟

بەدۆ – (بە دەرد و لەبەر خـۆیەوە) ئەرێ سـلۆ، خـواردنی خەڵك یاریی تۆیە. یانی تۆ هێشتا نازانی ئەو خواردنانەش چییە؟!

زینۆ – بەدۆ کوڕی خـۆم، پـێم وابـێ تـۆ ئەو کـوڕەت زۆر کەوتە دڵی؟

بەدۆ – ئەی چۆن نەکەوتە بەر دڵم یـادێ. ئـاخر ئەو ڕۆڵەیە تەنیا هێسك و پێست ماوەتەوە، دەزانی چەندی شت بە بیری من هێناوە؟ ئەو کوڕە چ جیـاوازییەکی هەیە لەگەڵ نیشـتمانەکەمان؟ ڕووت و نەخۆش و خوێنمژراو. ئەی دایە تۆ منت بۆ خستە بەر خوێندن؟ ئەی بەشە ناوخۆیی قوتابیانی دیجلە بۆچی باندۆرێکی وەهای لەسەر من بەجێ هێشـت؟ ئەرێ بـۆ ئەوە بـوو تـا منـیش بچمە ڕیزی ئەو دز و فەرهوودچییـانە؟ ئەدی بـۆ ئەوە نەبـوو تـا کەسـانی وەك سـلۆم خـۆش بـوێ و چـارەی دەرد و تیمـاری برینەکانیان بکەم؟

زینۆ – ڕاسـتە کـوڕی خـۆم ڕاسـتە. خـوا دەسـت بە بـاڵتەوە

بگریێ. ئاخر خۆ ناشکریێ ئەو منداڵەت نەکەوتبێتە بەر دلی. من بە تۆوە سەربەرز و کەیفخۆشم. ئەی براکانی تۆش هەمووی بەو دەرد و پەریشانییەی نەچوون؟! ماڵی ویرانم!

بەدۆ – دایە گیان تۆ بێخەم بە. ڕاستە ئەورۆ یەکشەمە، وەلێ نەخۆش هێشتا لە چاوەڕوانیی مندان. من بێدواکەوتن دەچم و دوایەش دێمەوە. سلۆ تۆش مەگری و تا من دێمەوە بۆ خۆت وازی بکە و نوقل و شیرینییەکانت بخۆ. وەك پێم گوتی نەگریێی ها!

سلۆ – دە باشە بڕۆ، بەڵام زوو وەرەوە، ئەگەرنا دەگریەم.

بەدۆ – بەسەرچاو سلۆ گیان.

(بەدۆ چاکەتەکەی لەبەر دەکا و جانتاکەی بە دەستەوە دەگریێ و دەردەکەویێ. زینۆش لە دواوە سەیری کوڕەکەی دەکا و دەست بە گریان دەکا. وەلێ ناهێڵێ سلۆ ڕۆندکەکانی ببینیێ).

زینۆ – ئێ سلۆ گیان دە پێم بڵێ، برسیت نییە؟

سلۆ – نا نا من نانم خواردییە.

زینۆ – چیت خواردووە؟

سلۆ – دایکم نانی گەنمی بۆ کرپیم.

زینۆ – ئەی چی دیکەش کوڕی خۆم؟

سلۆ – ئێ بەس نییە؟! چی دیم بۆ بکڕێ؟!

زینۆ – (لەسەر سینییەك خواردن دێنێ و لە پێش سلۆی دادەنێ) سلۆ کوڕی خۆم، دە وەرە دیسان نانی بخۆ.

(سلۆ سینیەکە دەباتە تەنیشت خۆی).

سلۆ – ناوەڵلا ناخۆم. بۆ دایکمی دەهێڵمەوە.

زینۆ – (زینۆ لە لایەك فرمێسکی چاوی وشك دەکاتەوە و لە لایەکی دیکەش، لەگەڵ سلۆ هەوڵ دەدا، تا نان بخوات) کوڕی خۆم تۆ نانەکەت بخۆ، بۆ دایکیشت نان هەیە و خەمت نەبێ.

(زینۆ دیسان، سینی و سفرەکە دەخاتەوە پێش سلۆ. سلۆش سەیرێکی خواردنەکانی سەر سینییەکە دەکات، بەڵام نازانێ خواردنەکان چین!)

سلۆ – ئەرێ ئەوە دۆشاوە؟

زینۆ – نا کوڕی خۆم، ئەوە موڕەبایە.

سلۆ – (تامێکی دەکات) وای وای، ئەوە شیرینە. ئێوە چەندتان شەکر هەیە؟ ئەی ئەو شتە بە پەلکانەی ناوی چییە؟

زینۆ – کوڕی خۆم ئەوە پەللك نییە و قەیسییە.

سلۆ – (دەست دەکاتە پەنیرێك و هەر زوو لە شوێنی خۆی دادەنێتەوە) ناوەڵلا من ژاژی ناخۆم.

زینۆ – کوڕی خۆم ئەوە ژاژی نییە و پەنیرە.

سلۆ – ئاخر ئەوە وەك کەشکە. دایکشم چەند جار دۆی لەناو ئاوایی هێناوە و بۆی دروست کردووین.

(بۆ ئەوەی سلۆ نەترسێ، زینۆ زۆری لێ ناکات. سلۆ سەیرێکی زەیتوون دەکات و نازانێ چییە؟ دانەیەك دەخاتە ناو دەوی، وەلێ نایخوا و دەیتفێنێتەوە).

زینۆ – ئەوە زەیتوونە کوڕی خۆم. دە بخۆ و شەرمێ مەکە.

سلۆ – نا نا دایە، ئەوە تەمەرهیندینە.

زینۆ – باشە تۆ چۆنت حەز لێیە با وابێ. ئەی گۆشت ناخۆی؟

سلۆ – (گۆشت دەناسێتەوە) ئەرێوەڵلا خۆ ئەوە گۆشتە. پار جەژنەی، لە ماڵی کەحیا خواردبووم. (پارچە گۆشتێك هەڵدەگرێ و زۆر بە خێرایی دەیخوا).

زینۆ – دە بخۆ کوڕی خۆم بخۆ. ئەی تۆ ئاوت ناوێ؟

سلۆ – بەڵێ.

(زینۆ پەرداخەك ئاوی بۆ دێنێت. سلۆش بە هەردوو دەستە

برینـدارەکانی ئـاوەکە هەڵـدەگرێ و زۆر بە سـەیری لێـی ورد دەبێتەوە)

سلۆ – ئاوی ئێوە چەند سپییە. وەڵلا وا بزانم ئەوە ئاو نیـیە و شەکرە؟

زینۆ – نا کوڕی خۆم نا. ئەوە ئاوە، ئەی ئاوی ئێوەش ئەوها نییە؟

سلۆ – دایکم ئاوی لە بیرێ دێنێ. بـۆیە ئـاوەکەش بەردەوام لێڵە. جا ئێمە ئاو لەناو شتی وەها بە ڕەونەق و سپی ناخۆینەوە.

زینۆ – سلۆ گیان ئەی ئێوە ئاو لەناو چی دەخۆنەوە؟

سلۆ – دایکم ١٠ هێلکەی ناردە دیـاربەکر، لەوێـش شـتێکی بە قـوڵپی تەنەکەی ئەمریکییـان بـۆ هێنـاین. ئـێمە بەوی ئـاوێ دەخۆینەوە، بەس ئەو وەك ئەوە جوان و بە ڕەونەق نییە.

(لە نـــاوچە کوردنشـــینەکان، ئەو قوتـــووەی ئەمریکییەکـــان خـــواردنی لە قووتـــوکراوی خۆیـــان لەنـــاو دەخـــوارد و دوای تەواوبوونی فڕێیان دەدا، خەڵك وەکوو قاپ و قاچاخی بەهـادار لە ماڵەوە بەکاریان دەهێنـا. لەو سـەروبەندیدا، دەرگـای حەوشـە دەکرێـتەوە و گەنجێك بەدیار دەکەوێت و لە زینۆ دەپرسێ).

گەنجەکە - خاتوون ئەرێ ئێرە ماڵی دختۆرە؟

زینۆ – بەڵێ کوڕی خۆم، بەڵام بۆ پرسیت؟

گەنجەکە - چەند کەسێکی گوند لێرەنە و دەپرسن، پێیم وابێ نەخۆشیان هەیە. لەبەر ئەوەی ناویشی لەسەر دەرگا نەنووسرابوو بۆیە بە زەحمەت بینیمانەوە.

زینۆ – کوڕی خۆم، زۆر بە کەمی لە ماڵەوە لە نەخۆشان دەنۆڕی. دختۆر بەردەوام لە بیمارستانە. بەڵام ئێوە کەرەم کەن و وەرنە ژوورەوە.

(گوندییەکان و نەخۆشەکەیان دێنە ژوورەوە. زینۆ دەیانناسێتەوە و دەزانێ گوندییەکانی ئەون).

زینۆ – گوڵێ، پەپوو، خوشکی خۆم ئەوە ئێوەن؟ خێرە ئینشاڵا؟

گوڵێ – کچێ خێری چ و حاڵی چ خوشکێ. مەمۆمان هێناوەتە دختۆری.

زینۆ – (لە کوڕەکەی گوڵێ دەنۆڕی، کە لەناو لێف پێچاویانەتەوە) بە داخەوە، ئەوە مەمۆیە وەهای لێ هاتووە؟

گوڵێ – (بە گریانەوە) بریا تۆ ئەوانی دیکەت بینیبا. ئەوە هیچ نەبێ گیانێکی لەبەردایە. پێش ئەوە سێ ڕۆڵەی دیکەم لە بن خاکی نایە. ئەو منداڵەی تۆ گەلێکت خۆش دەویست، ئەویش مرد.

زینۆ — ئەی بۆ تا ئێستا نەهاتوون؟

بەهار — (خوشکی گوڵێیە و لەگەڵی هاتووە) خوشکی خۆم زینۆ، ئێمە هیچمان نەبوو تا لەگەڵ خۆمانی بێنین. بۆیە گوتمان شەرمە بچین.

زینۆ — دە تۆ سەیری قسەی بەهار بکە. ئاخر کچم تووخوا شەرم نییە ئەو قسانە دەکەی؟ ئاخر بەدۆ بە پارە چارەسەرتان دەکا؟ تکاتان لێ دەکەم بەدۆ با گوێی لەو قسانە نەبێ.

گوڵێ — ئاخر خوشکی خۆم، هاتنە شار تۆ بتەوێ یان نا، پارەی هەر دەوێ. چووین و لە کاروانسەرای ماینەوە. دوو مەجیدیمان دا و کابراش قۆچانێکی داینێ.

زینۆ — گوڵێ، کیژێ شەرم نییە ئێمەماڵمان لێرە بێ و تۆش بچییە کاروانسەرا؟

بەهار — خوشکە زینۆ وا مەڵێ، خۆ ناکرێ بەو حاڵە پەرێشانەی خۆمانەوە بێینە لای تۆ و دختۆریش عەزیەت بدەین.

زینۆ — بەهار قسەی وا مەکە. وەڵڵا بەدۆ لە ئێمە زیاتر کەیفی بە میوانان دێت. (لەو سەروبەندەیدا سلۆ دێتە لایان) سەیرکەن، تۆزێك پێش ئێوە دایکی ئەو کورە و ئەو منداڵە هاتن. بەدۆ گوتی دەبی لێرە بمینێیتەوە و نەچیتەوە کاروانسەرا.

(برۆ لە دەرەوە دەگەڕێتەوە و ژنەکان دەبینن).

بەهار – زینۆ ئەوە کاکە برۆ هاتەوە.

برۆ – گەنجینە بەخێر بێن. (برۆ سەیری منداڵە نەخۆشەکە دەکا) ئاخر ئاخر، ماڵوێران ئەوە مەمۆیە ئەوەهای لێ هاتووە؟

گوڵێ – بەڵێ کاکە گیان، ئەی تۆ بۆ ناپرسی ئەوانەی دی لە کوێن؟!

برۆ – ئەوەی مایە ساغ و سەلامەت بێ و تەمەنی درێژیان بۆ ئەو بێت. ئەی بۆچی خەلۆ نەهات؟!

بەهار – ئاخر نەیدەتوانی کاکە گیان. خۆت دەزانی کاتی جۆت بوو، بۆیە کەحیا ڕێگای نەدا بێ.

برۆ – وەڵڵا ڕاست دەکەن، کەحیا ڕێگا نادا. بەڵام دووبارە ئێوە بەخێر هاتن.

(لەو سەروبەندەیدا، دایکی سلۆ دێتە هوندوڕ).

زینۆ – وەرە خەنسێ خاتوون. سەیرکە بزانە من و سلۆ چەند بووینە برادەر.

خەنسێ – خولامی تۆ بێ. خوا بکا تۆی عێذز نەکردبێ؟

سلۆ – ناوەڵڵا یادێ هیچ نەگریام. (مشتێك شەکرۆکە لە گیرفانی خۆی دەردەهێنێ و دەیداتە دایکی). دایە بزانە دختۆر

چیی دامیّ؟ وەلیّ من هەموویم نەخوارد و گۆتم بۆ دایك و بابیشم هەڵدەگرم. دایە ئێرە زۆر لە ماڵی ئێمە خۆشترە. هەموو شتێکیشیان هەیە. تەمەشاکە، شەکرۆکە و گندۆرە و گۆشت و زۆر شتی دیکەش. ئەتوو بەس ئاوەکەیان بخۆوە بزانە چەند خۆشە. دایە ئاوێکی سپی و ڕوون و خاوێنە.

خەنسیّ – دەیاڵلا کوڕی خۆم یاڵلا. خوا زیاتری دەکا ئینشاڵلا، ئەها ئەوە دختۆریش هاتەوە.

بەدۆ – ئۆۆۆ ماشەڵلای لیّ بیّ. دەستە و تاخمی دایکم هەمووی گەیشتوونەتە یەك.

زینۆ – بەدۆ کوڕی خۆم تۆ ئەوانەت ناسییەوە یان نا؟ گوڵیّ و بەهاری پوورتن.

بەدۆ – ئەریّ ئەریّ دایە گیان، ئەوانم ناسییەوە. ئێوە بەخێر هاتن سەر چاوان؛ وەلیّ پێم بڵێن خێرە؟

گوڵیّ – خێری چی کوڕی خۆم! ئێمە لە حەژمەت و داخی منداڵ مردن سووتاین، زارۆکێکمان بۆ نەماوەتەوە. مەمۆم زندییە، ئەویش پەرێشانە. هێنام تا تۆ دەرمانێکی بکەی.

(بەدۆ جانتاکەی دادەنیّ و بە دەرد و خەم و پەژارەوە، لە مەمۆ دەنۆڕیّ. دەستێکی لە دەستی مەمۆ و دەستەکەی دیکەشی لەسەر سەری سلۆ دادەنیّ. برۆ و زینۆ و دایکی منداڵەکان تەمەشایان دەکەن).

بەدۆ – خەڵکینە، ڕاستە ئێمە لەناو دەرد و کەسـەر و خەم و مەینەتدا سووتاوین، وەلێ ئیدی کاتی خۆدەربازکردنێیە.

# برینا ڕەش[1]

موسا عەنتەر

لە تورکییەوە: محەمەد عزەدین

دەمەوێ دیسان بگەڕێمەوە حوجرەی کولەمەرگیی ژمارە سیی و هەشتم. گەرچی چەند کەسێکی وەك عورفی ئاق قۆینلوو و ئەسەد جەمیل ئۆغلوو و موحسین شاڤاتا بە تەمەن گەورە بوون، لێ بەشێکی زۆری هەڤالانی ئەوێم وەك ڕۆڵەی خۆم دەبینین. چەند کەسێکی وەك زیا شەڕەفخان ئۆغلوو[2] و عەلی کەرەهانیش خۆیان لە ئێمە جیا دەکردەوە. ئەمڕۆ، لەناو ئەو برادەرانە، نزیکەی بیست کەسیان لە ژیان ماون و شاهێدی ئەو نووسینانەن. هەم لە زیندان هەمیش لە دەرەوە بە شەوکەتێکی باوکانە ئاگام لەو گەنجە بە شەڕەفانەی گەلەکەم بوو.

لە دوادوایی ژیانی ناو حوجرەمان، ئەها وەك لە سەرەوە ئاماژەم پێ کرد، بەرامبەر بە پێنج لیرە ئاگاداری هەواڵی یەکدی دەبووین. سەیرم کرد، ئەو ڕۆڵە خۆشەویستانەم چەندان مانگە لە دۆخێکی زۆر ناخۆشدان، بۆیە منیش بە شێوازی نووسینی خۆم

---

(١) چەند لاپەڕەیەکە لە بیرەوەرییەکانی موسا عەنتەر، کە تیایدا باسی دۆخ و چۆنیەتیی نووسینی شانۆنامەی "برینا ڕەش" دەکات. (وەرگێڕ).

(٢) زیا شەڕەفخان ئۆغلوو (١٩١٤-١٩٨٢) سیاسەتمەدارێکی کوردە. لە نێوان سالانی (١٩٦٤-١٩٦٧) ئەندامی بالای پەرلەمانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

چیرۆکێکی خەندەئامێزم نووسی و بۆم ناردن. زۆریان پێ خۆش بوو و گوتیان: "کاکە تخوا شانۆنامەیەکمان بۆ بنووسە". برادەرانم شاهێدن کە ڕۆژی دواتر (برینا ڕەش)م نووسی، ئینجا ئەوەشم بۆ ناردن، بەڵام زۆربەیان باوەڕیان نەکرد، چونکە پێیان وابوو پێشتر نووسیوومە. من شانۆنامەکەم لەوێ نووسی، چونکە بەو هێزەی ئەوان پێیان بەخشیم، لە ماوەی یەك ڕۆژدا تەواوم کرد. دیسان دەیڵێمەوە و بۆ ئەمەش برادەرانم دەزانن، لەو بارودۆخەی ناو حوجرە بێ هەڵەچنی کە ئازاد کراین شانۆنامەکەم چاپ کرد.

لە ماوەیەکی زۆر کورت باسی ئەو دۆخە نالەبارەی کوردستانم تێدا کرد، کە سەرجەم بەسەرهات و ڕووداوەکان چیرۆکی ڕاستەقینەی گەلەکەم بوون. دواتر لە لایەن زۆر کوردی بە ئەمەکەوە دەستخۆشیم بۆ هات، دوای ئەوەی شانۆنامەکە وەرگێڕدرایە سەر زمانی چیکۆسلۆڤاکی و بەلجیکی و هۆڵەندی و دانیمارکی و سویدی و چەندان زمانی دیکە، ئینجا نمایش کرا و کاردانەوەیەکی باشی لێ کەوتەوە، بەڵام ئەوە لە تورکیا قەدەغە بوو.

ڕۆژێك، شەهاب باڵجی ئۆغلوو، بە تەلەفۆن بانگهێشتی لای خۆی کردم، منیش چوومە لای. دیار بوو وێنەکێشێکی سویدی بە سوودوەرگرتن لە وێنەی ناو دەقە شانۆییەکەم چەندان تابلۆی کێشابوو، دوای دروستکردنیان زۆر پارەی قازانج کردبوو، بۆیە بە پارەی ئەوکات سێ هەزار و پێنجسەت لیرەی بۆ منیش ناردبوو، ئەوە یەکەم جارم بوو بە هۆی نووسینەکانمەوە پارە قازانج بکەم، بۆیە لەگەڵ ئەوەی نەمویست پارەکە وەرگرم، بەڵام لەبەر پێداگریی شەهاب پارەکەم هێنا.

ساڵی ١٩٥٠، پارتیزانێکی ساختەی پارتی دیموکرات[1]، کە تا ئەوسا بوونی کوردی پێ هەزم نەدەکرا، دژی شانۆنامەی (برینا ڕەش) بە دروشمی (کورد نابنە پیاو، کورد نابنە ڕووناکبیر) شانۆنامەیەکی سووك و بێنرخ و دوژمندارانەی دژی گەلی کورد نووسی. بۆ تێگەیشتن لەو بۆچوونەم پێویستە شانۆنامەکە بخوێندرێتەوە. جا لە شانۆگەریەکە بۆچوونی (کوردەکانی پارتی دیموکرات)ی ئەوسای تێدا باس کرابوو.

لە تەواوی ناوچە کوردییەکانی تورکیا، ساڵانە گەنم لە مانگی ١٠ تۆ دەکرێت، بەڵام لە مانگی چوار حکوومەت بە هەزاران تۆن گەنمی ژەهراویکراوی لە ڕێگای ئاغا و شێخە لایەنگرەکانی لە ناوچەکە، بە ناوی گەنمی تۆکردن دابەش دەکرد. ئەو گەنمە ژەهراویکراوە لە لایەن ئاغای زەوییەکانەوە لە جۆ هەرزانتر بە خەڵکی هەژار و نەداری کورد دەفرۆشرا، کەچی ئەو گەنمانە بە نەزانی لە لایەن خەڵکەوە دەکرا بە ئارد، ئاردەکەش دەکرا نان، بەڵام وەرە و ببینە ئەو گەنمەی پێویست بوو دژی حەشەرات بەکار بهێندرێت، بە زانین بۆ لەناوبردنی گەلی کورد بەکار دەهێندرا. لە ماوەیەکی کەم، بە تایبەتی لەسەر منداڵان، کاریگەرییە نەرێنییەکانی دەرکەوتن، ئەو برینەی بە هۆی خواردنی ئەو نانەوە لەناو خەڵك بڵاو بووبۆوە پێیان دەگوت (برینا ڕەش).

ئەوکات، لە ڕۆژنامەی (ئیلەری یورد)، لە دیاربەکر کارم

---

[1] لە دوای پارتی گەلی کۆماری CHP، بە دووەمین پارتی سیاسی دادەنرێت لە مێژووی کۆماری تورکیا. پارتی دیموکرات دوای ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی تاك پارتایەتی لە تورکیا، لە ساڵی ١٩٤٦ دادەمەزرێت، لە ساڵانی (١٩٥٠-١٩٦٠) دەبێتە فەرمانڕەوای تورکیا. لە ٢٧ی مایسی ١٩٦٠ کودەتایەکی سەربازی بەسەردا دەکرێت و دوای لە دەستدانی دەسەڵات، پارتەکەش لە تورکیا دادەخرێت. (وەرگێڕ).

دەکرد. ئەو پرسەم زۆر هێنا سەر زاران، بەڵام ئەو وەحشیانە بۆ بنبڕکردنی ڕەگی کوردستان سڵیان لە هیچ نەدەکردەوە. من بۆ زانینی ئەو دۆخە ئەوسا لە دیاربەکر لە ناوچەکانی چونگوش و دیجلە و هازرۆ و لیجە و هیلڤان و چنار و بیسمیل دەستم بە گەڕانێك کرد. لەوێ سەردانی نەخۆشخانە بێ دکتۆرەکانی ئەو قەزا و ناحیانەم کرد. ئەو منداڵانەم بینی کە بەو برینە گەورە گەورانەی بە لەشیانەوە بوو، وەك فەرخە مەیموونیان لێ هاتبوو. منداڵەکان دەموچاویان ڕەش ڕەش هەڵگەڕابوو، هەموو جەستەشیان ببووە یەك پارچە موو. بە ئاشکرا شوێنی ئەو پارچە گۆشتە ڕزیوانە لەسەر دەموچاو و جەستەیان دەبیندرا، کە هەرگیز چاك نەدەبوونەوە، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆری منداڵەکان بمرن. ئەو ڕووداوە لە ساڵی ١٩٥٨ ڕووی دابوو. گەر ئەمڕۆ سەرژمێرییەك بکرێ، کەمیی ڕێژەی دووگیانبوونی ئافرەتانی کورد لەو ناوچانە زۆر بە ئاشکرا بە دیار دەکەوێت.

ئەو ڕووداوە زۆری کار تێ کردم، بۆیە هۆکارێکی سەرەکیی نووسینی شانۆنامەکەم بوو. لە ڕۆژنامەی ئیلەری یورد ئەو ڕووداوەم زوو زوو دەخستە سەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکە، بەڵام وەزارەتی تەندروستی بە ڕاپۆرتی ساختە زوو زوو دەیویست وەڵامم بداتەوە، گوایە ئەو نەخۆشییە پەیوەندیی بەو گەنمەوە نییە کە دابەش کراوە، بەڵکوو سەرچاوەکەی دەچێتەوە سەر پێشتری. ڕووداوەکە دەنگدانەوەیەکی زۆری دروست کرد، بگرە نازم حیکمەتیش لە مۆسکۆوە پشتگیری کردم و شیعرێکی نووسی بە ناوی (**گیرۆدەبوونی وەزیری تەندروستی بە برینی ڕەش**).

دەربارەی "برینا ڕەش" بەسەرهاتێکم هەیە لە پەرلەمانی تورکیا. دانیشتنێکی دادگام هەبوو لە ئەنقەرە، زۆر برادەریشم لەوێ پەرلەمانتار بوون، بۆیە، کە چوومە ئەوێ چەند دانەیەکی پەرتووکەکەم لەگەڵ خۆم برد. لەناو پەرلەمانی تورکیا، چەندین پەرلەمانتاری ناوچە کوردییەکان لە دەورم کۆ بوونەوە، لەگەڵ ئەوان بەدەم چاخواردنەوە یەکە و دانەیەك لە پەرتووکەکەم بە دیاری دانێ. ئەوسا مامۆستا قادرجان کافلی لە ڕۆژنامەی (تەرجوومە) بەردەوام وتاری ئایینیی دەنووسی، ئەویش هاتە لامان. کاتێك پەرتووکەکەی بە دەستەوە گرت، برادەرانی دیکەمان سەریان خستە سەری و پێیان گوت: "مامۆستا تۆ هەموو ڕۆژێك وتاری ئایینی دەنووسی، بەڵام لەژێر نووسینەکانت وێنەی ڕووتی ئافرەتان بڵاو دەکرێتەوە، ئەوە چۆن دەبێت؟". مامۆستا وەڵامی دانەوە: "کوڕم ڕۆژنامەکەی من وەك ئیستانبوڵە، لە لایەك گۆڕی حەزرەتی سوڵتان ئەیوبی لێیە، لە لایەکی دیکەشی قەحپەخانەی قەرەقۆی". ئێمە پێدەکەنین و مامۆستاش سەیری پەرتووکەکەمی دەکرد: "ئەوە چ جۆرە پەرتووکێکە، نیوەی تورکییە و نیوەی کوردییە؟!" مامۆستا ئاوای بە من گوت: "پەرتووکەکەم وەك تورکیایە، نیوەی تورك و نیوەی کوردە"، منیش ئاوا وەڵامم داوە، ئەوجارە ئەویش لەگەڵ ئێمە پێکەنی.

پاشان، جیهاد بابان[1] هاتە لامان، ئەو پەرلەمانتاری جەهەپە[2] و سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئولوس) بوو، لێی پرسیم ڕۆژنامەکەمان

---

(1) مستەفا جیهاد بابان (١٩١١-١٩٨٤) ڕۆژنامەڤان و سیاسەتمەدار. لە ماوەی ژیانی سیاسیدا پەرلەمانتاری جەهەپە بووە و لە حکوومەتیش پۆستی وەزیری گەشتوگوزار و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی لە ئەستۆ گرتووە. (وەرگێڕ).

(2) CHP پارتی گەلی کۆماری، یەکەمین پارتی کۆماری تورکیایە، ساڵی ١٩٢٣ لە لایەن مستەفا کەمال ئەتاتورکەوە دامەزرێندرا. (وەرگێڕ).

دەخوێنییەوە؟ منیش گوتم: "لەبەر ئەوەی لە ئیستانبوڵ نامێنمەوە، بۆیە هەموو ژمارەکانی ناگاتە دەستم، بەڵام ئەو دوو ڕۆژەی لە ئەنقەرەم چەند لاپەڕەیەکم لێ خوێندۆتەوە، بەڵام بە هۆی وتارێکیانەوە لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکە پەشیمان بوومەتەوە". چونکە بیرۆکەی نووسینەکەی بەو شێوەیە بوو: سولێمان دەمیرەلی[1] سەرۆکوەزیران، چووەتە کۆبوونەوەی CENTO[2]، دەمیرەل لەگەڵ ئێران و عێراق و پاکستان لەسەر پرسی کورد گەیشتوونەتە ڕێککەوتنێك. جیهاد بابانیش ڕێککەوتنەکەی پێ باش بووە، بۆیە بۆ پرسی باڵای نەتەوەیی تورکیا داوای لە پارتەکان دەکرد یەکگرتوو بن. کاتێك وتارەکەیم بۆ پوخت کردەوە، شەرم دایگرت و گوتی: "مووسای برام، تۆ دەتەوێ هەمووومان وەك خۆت بە ڕەوشت بین، کەچی ئێمە بووینە قەحپەی ناو سیاسەت". هەر لەبەر ئەو قەحپاتیەشی، مامی ڕاستەقینەی، شوکروو بابان ڕێگای نەدەدا بچێتە ماڵەکەی. باش بوو جیهاد بابان منداڵی نەبوو، تا ئەویش وەك کامەران ئینان[3] ببێتە پەڵەیەکی ڕەش بە نێوچاوانی کوردەوە.

---

(١) سولێمان دەمیرەل (١٩٢٤-٢٠١٥) سیاسەتڤانی تورك، بە نۆیەمین سەرۆککۆماری تورکیا دادەنرێت. دەمیرەل لە نێوان ساڵانی (١٩٩٣-٢٠٠٠) سەرۆککۆماری تورکیا بووە. بەر لەوەش پێنج جار لە پێنج خول و سەردەمی جیاوازدا سەرۆکوەزیرانی تورکیا بووە. جگە لەوەی سەرۆکایەتیی هەردوو پارتی عەدالەت و ڕێگای ڕاستی کردووە (وەرگێڕ).

(٢) Central Treaty Organization ڕێکخراوی ڕێککەوتنی ناوەندی، یاخود ناوە کۆنەکەی (میساقی بەغدا)، ڕێکخراوێکی بەرگریی هاوبەش بوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٥٥ – ١٩٥٩) لە لایەن بەریتانیا و تورکیا و عێراق و ئێران و پاکستان دامەزرێندرا بۆ ڕێگریکردن لە فراوانبوونی نفوزی یەکێتیی سۆڤیەتیی پێشوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. (وەرگێڕ).

(٣) کامەران ئینان (١٩٢٩ – ٢٠١٥) لە دایك بووی بەدلیسی باکووری کوردستانە و لە نێوان ساڵانی (١٩٧٧ – ١٩٧٨) وەزیری وزە و سەرچاوە سروشتیەکانی تورکیا بووە. (وەرگێڕ).

بەو دواییانە، گەنجە کوردەکانی سووریا، "برینا ڕەش"یان کردبووە کوردی و ئینجا لە چوارچێوەی فیلمێکدا وێنەیان گرتبوو، بەرامبەر بەو هەستە نەتەوەییەیان بە ناوی خۆم و گەلەکەم سوپاسگوزارییەکیان قەرزدارم.

"جەنابی دادوەر، خۆم کوردبوونم هەڵنەبژاردووە، وەلێ گەر ئەوەنـدە بەتوانـان، دادگـایی ئەوەی بـکەن منـی وەك کوردێـك هێناوەتە دنیا!"

**مووسا عەنتەر**



لە دەستە چەپڕا، عەنتەر عەنتەر، مووسا عەنتەر، دیجلە عەنتەر، سلێمان عەنتەر، ئیستانبول، ١٩٦٨.




بەرگی چاپی یەکەمی (برینا ڕەش)



لە دەستە ڕاستەوە مووسا عەنتەر- حوسێن شەریف وانلی - ئیسماعیل بێشکچی



لە پێشەوە عیسمەت شەریف وانلی و مووسا عەنتەر و ئەوەی دواوەش نەناسراوە



مووسا عەنتەر لەگەڵماڵباتی بەدرخانییەکان، ئیستانبوڵ، ١٩٦٨



مووسا عەنتەر و فرات جەوەری، ئیستانبوڵ، ١٩٩٠

## کتێبەکانی دیکەی وەرگێڕ

بیرەوەرییەکانم، مووسا عەنتەر، لە تورکییەوە، محەمەد عزەدین. دەزگای فام

یادەوەرییەکان، ئیسماعیل بێشکچی، لە تورکییەوە محەمەد عزەدین.

برینا ڕەش، مووسا عەنتەر، لە کورمانجییەوە محەمەد عزەدین.

مەکتووب بۆ ئەتاتورك، جەلادەت عالی بەدرخان، لە تورکی عوسمانلییەوە محەمەد عزەدین.

کورتەی ژیانم، ئەکرەم جەمیل پاشا، لە تورکییەوە محەمەد عزەدین.

تیرۆری دەوڵەت لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، ئیسماعیل بێشکچی، لە تورکییەوە محەمەد عزەدین، تۆڕی میدیایی ڕووداو.

ژیانی مەلا سەعیدی کوردی (سەعید نورسی)، عەبدولڕەحمان نورسی، لە تورکییەوە محەمەد عزەدین.

# BIRÎNA REŞ

دەقە ئەدەبییەکان، لە ڕووی مانا و گرنگییەوە، پەیوەندییەکی تایبەت و بەهێزیان بە سەردەمەکانی خۆیانەوە هەیە.

سەردەمی وەها بووە، نووسینی ڕستەیەك، یان نووسینەوەی چەند وشەیەك وەك شۆڕشێك وابووە. بۆیە وەها کارێك بە شەرەفێکی گەورە داندراوە. لە کاتێکدا سەردەمی وەهاش هەبووە، نووسینی چەندان بەرگی کتێبیش هیچ گرنگییان نەبووە. بۆیە ئەوەی (برینا رەش)ی مووسا عەنتەری کردووەتە دەقێکی زۆر گرنگ و نەمری کردووە، تایبەتمەندییەکانی سەردەمی نووسینی ئەو شانۆنامەیەیە. لە سەردەمێکدا کەس نەیدەوێرا بڵێ کوردم و نەدەتواندرا ڕستەیەکیش بە کوردی بنووسرێ، مووسا عەنتەر لەناو زیندانێکی سەربازی لە ئیستانبوڵ، شانۆنامەیەکی کوردیی زۆر مانادار و جوان دەنووسێ".

**محەمەد نوزوون**



5,000 IQD
9 789922 987651


دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication

COVER DESIGN BY